زنجیرەی پەروەردە و بانگەواز

( ١٢٠ )

# ڕۆژێك
# لەگەڵ
# خۆشەویستەكەتدا (مُـــحَمَّد ﷺ)

(يومٌ معَ حبيبكَ مُـــحَمَّد ﷺ)


لە دانانی

أيـــمن بن عبد العزيز أبانـــمي

وەرگێڕانی

محمد عبد الرحمن لطیف

وتارخوێنی مزگەوتی (شێخ إبراهیم) / كەلار



چاپی سێیەم

١٤٤١ ك

✍📖 **ناوی کتێب** : **ڕۆژێك لەگەڵ خۆشەویستەکەتدا** (مُـــحَمَّد ﷺ) .

✍📖 **ناوی نووسەر :** الشيخ أيـــمن بن عبد العزيز أبانـــمي .

✍📖 **ناوی وەرگێڕ :** محمد عبد الرحمن لطيف .

✍📖 **زنجیرە :** زنجیرەی (١٢٠) لە (زنجیرەی پەروەردە و بانگەوان) .

✍📖 **ژمارەی سپاردن :** ژمارە سپاردنی (٩٦٢)ی ساڵی (٢٠١٨) پێ دراوە لە لایـەن بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوەی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە .

✍📖 **نۆرەی چاپ :** سێیەم .

✍📖 **ساڵی چاپ :** ١٤٤١ ك ـ ٢٠٢٠ .

✍📖 **شوێنی چاپ** : چاپەمەنی زانا / سلێمانی .

**لە بڵاوکراوەکانی**

**کتێبخانەی زانستی بەسوود / کەلار**

قال الإمام الشافعي رحمهُ الله :

كُلُّ العُلومِ سِوَى القُرآنِ مَشغَلَة     إلَّا الـــحَدِيثَ وإلَّا الفِقْـــهَ في الدِّينِ

العِلمُ ما كانَ فيـــهِ قال حَدَّثنا     وما سِوَى ذَاكَ وَسواسُ الشَّياطيـــنِ

# رۆژێك لەگەڵ خۆشەویستەکەتدا (ﷺ)

ســـوپاس و ســـتایش بـــۆ ئـــەو خوایـــەی کـــە ڕێگـــای خۆشویـــستنی خـــۆیی وابەســـتە کـــردووە بـــە شـــوێنکەوتنی هەرەخۆشەویستی هەڵبژێردراویەوە (مُحَمَّد ﷺ) و فەرموویەتی :

﴿ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٣١ ﴾ [آل عمران] .

واتە : ئەی پێغەمبـەر پێیان بڵـێ : ئەگـەر ئێـوە خواتـان خۆشدەوێت ئەوا شوێنی من بکەون [لـە پاداشـتی ئەمەشـدا] خوا خۆشـتانی دەوێـت و لـە تاوانـەکانتان خۆشـدەبێت ، وە خوا لێخۆشبوو و بە بەزەییە .

وە ئیمان و باوەڕهێنانیشی ڕەتکردووەتەوە لـەو کەسـەی کە خۆشویستنی هەرکەسێکی تـر لـە دروسـتکراوەکان پـێش بخـات بەســـەر خۆشویـــستنی خۆشەویـــستەکەیەوە (ﷺ) ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّـــى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ))[1] .

---

[1] صحيح البخاري رقم : (١٥) .

واتــە : هــیچ یــەكێك لــە ئێــوە ئیمــانی نــی‌یــە تــاوەكو مــن خۆشەویستتر نەبم بە لایەوە لــە بــاوكی و منداڵــەكانی و هــەر هەموو خەڵكیش .

وە صەلات و سەلامی تێروتەسەل و تەواو و كاملێش لەسەر پێغەمبــەری هەڵبــژێردراو و ڕێپیــشاندەری دەستهەڵــچنكراو و چــرای رووناككــەرەوە و بــانگخوازی مــژدەدەر و ڕەحمــەتی خــەلاتكراو و نیعمــەتی بەخــشراو بێــت ، صــەلات و ســەلامی خوای لەسەر بێت هەنــدەی كــە شــەو و ڕۆژ بــەدوای یــەكتردا دێــن و دەڕۆن ، وە صــەلات و ســەلامی خــوای لەســەر بێــت هەنــدەی كــە ویردخوێنــانی چــاكەكار نــاوی دێــنن و باســی دەكەن ، وە صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت بە ژمارەی دڵۆپــە بارانــەكان و گــەلای دار و درەختــەكان و دەنكــە لم و بــەردەكان ، وە لەســەر كــەس‌وكــارە پــاك و خاوێنــەكانی و لەســەر موهــاجیرین و ئەنــصار و شــوێنكەوتوانیان بــە چــاكە تاوەكو ڕۆژی پاداشت وەرگرتنەوە ، دوای ئەوە :

بەڕاســتی موســڵمانی ڕاســتەقینە شــەیدا و تامــەزرۆی خۆشەویــستەكەیەتی (مُــــــحَمَّد ﷺ) ، وە ئاواتــەخوازە كــە

ئەویش یەکێك ببوایـەت لـە صـەحابەکانی و لای پێغەمبـەری هەڵبژێـردراو دابنشتـایە و هەردوو چاوی پـڕ بکردایە لە نور و رووناکی روومـەتی ڕێـزداری و وتـە شـیرین و سـازگارەکانی ببیـستایە (ﷺ) ، وە ئـەو رەوشـت و هەڵـسوکەوتانەی ئـەوی ببینایە کە دڵ ڕادەکێشن ، وە ڕابوەستایە لەسەر عیبادەت و پەرستشەکانی بۆ خوای پەروەردگار ، ئەگـەر چـی لـە پێنـاو ئەوەیـشدا هەرچـی موڵـك و سـامانی هەیـە ببەخـشێت وەکـو جێبەجێکردنێك بۆ ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) : ((مِنْ أَشَدِّ أُمَّتِـــي لِـــي حُبًّا نَاسٌ يَكُونُونَ بَعْـــدِي يَـــوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ رَآنِـــي بِأَهْلِهِ وَمَالِهِ))[1].

واتە : لە نێو ئوممەتەکەمدا خەڵکانێك زیاتر منیـان خـۆش دەوێت کە لە پاش من دێن و یەکێکیان ئاواتـەخوازە بـەوەی کە منی ببینایەت و لە بەرامبەر ئـەوەدا کـەس‌وکـار و مـاڵ و سامانی ببەخشێت و بکات بە قوربانی ئەوە .

لەبەر ئەوە حـاڵی تابـعین و شوێنکـەوتوان بـەو شێـوازە بووە :

---

[1] صحيح مسلم رقم : (٧٠٧٤) .

۞ قَالَ ابْنُ سِيرِينَ لِعَبِيدَةَ بْنِ عَمْرٍو رَحِمَهُمَا اللهُ : (عِنْدَنَا مِنْ شَعَرِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَصَبْنَاهُ مِنْ قِبَلِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ، فَقَالَ عَبِيـــدَةُ : لَأَنْ تَكُونَ عِنْدِي شَعَرَةٌ مِنْهُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا)[1].

**واتە : (ابْنُ سِيرِين) وتی بە (عَبِيدَةُ بْنُ عَمْرِو) ڕەحمەتی خوا لە هەردووکیان : هەندێك مووی پێغەمبەرمان (ﷺ) لە لایە کە لە لایەن (أَنَس بْنُ مَالِك)ـەوە دەستمان کەوتووە ، (عَبِيدَة)یش وتی : ئەگەر من یەك تاڵە مووم لەوە لەلا بێت ئەوا پێم خۆشترە لە دونیا و ئەوەشی کە تێیدایە .**

**ئیمامی (الذَّهَبِي) قسەی لەسەر ئەمە کردووە و فەرموویەتی :** (ومثل هذا يقوله هذا الإمام بعد النبـــي ﷺ بـــخمسين سنة !! فما الذي نقولــه نــحن فـــي وقتنا لو وجدنا بعــض شــعره بإسناد ثابت ؟ ..)[2] ودون إثبات ذلك خرط القتاد .

**واتە : (نموونەی ئەم وتەیە کە ئەم ئیمام و پێشەوایە لە پاش پێغەمبەر (ﷺ) بە پەنجا ساڵ فەرموویەتی !! ئەی دەبێت لە کاتی ئێستاماندا ئێمە چی بڵێین ئەگەر هەندێك لە**

---

[1] صحيح البخاري رقم : (١٦٨) .

[2] سير أعلام النبلاء : (٤ / ٤٢) .

مووى پێغەمبەرمان (ﷺ) بينيەوە بە سەنەدێكى سەلمێنراو ؟ ..) وە سەلماندنى ئەوەيش وەك ئەوەيە كە دارى دڕكاوى بە دەست بتاشيت كە مەحاڵە .

**هەروەها ئيمامى (الذهبـــي) فەرموويـەتى :** (وقد ثبت أنه ﷺ لـــمَّا حلق رأسه فرَّق شعره الــمُطهَّر على أصحابه إكرامـــاً لهم بذلك[1] ، فوالـــهفي على تقبيل شعرة منها)[2] .

**واتە : وە سـەلمێنراوە پێغەمبـەر (ﷺ) كاتێـك كـە سـەرى تاشيوە مووە پاكەكانى دابەش كردووە بەسەر صەحابەكانيدا وەكـو رێزلێنانێـك بۆيـان بـەو كـارە ، ئـاى چـەند شـەيدا و تامەزرۆى ماچ كردنى تاڵە موويـەكم لـەو مووانـەى پێغەمبـەر (ﷺ) .**

❁ قَالَ جُبَيْرُ بْنُ نُفَيْرٍ رَحِمَهُ اللهُ : (جَلَسْنَا إِلَى الْمِقْــدَادِ بْـــنِ الْأَسْوَدِ (رضي الله عنه) يَوْمًا فَمَرَّ بِهِ رَجُلٌ فَقَالَ : طُوبَـــى لِــهَاتَيْنِ الْعَيْنَيْنِ اللَّتَيْنِ رَأَتَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) ، وَاللَّهِ لَوَدِدْنَا أَنَّا رَأَيْنَا مَـــا رَأَيْـــتَ وَشَهِدْنَا مَا شَهِدْتَ)[3] .

---

[1] صحيح مسلم رقم : (٣١٤٢) .

[2] سير أعلام النبلاء : (١٣ / ٥٤٦) .

[3] مسند الإمام أحمد رقم : (٢٣٨١٠) .

واتــە : (جُبَيْر)ی كـوڕی (نُفَيْـــر) ڕەحمـەتـی خـوای لێبێـت فەرموویەتـی : ڕۆژێك ئێمە لەگـەڵ (مِقْدَاد)ی كـوڕی (أَسْـــوَد) (رضي الله عنه) دانیـــشتبووین و پیاوێــك بەلایــدا تێپــەڕی و وتــی : ئاسوودەیی و خۆشحاڵی بۆ ئەو دوو چاوەی كـە پێغەمبـەری خوایان (ﷺ) بینیوە ، سوێند بـە خـوا ئاواتـەخوازی ئـەوەین ئێمـەیش ئـەوەمان ببینایـەت كـە تـۆ بینیوتـە و ئامـادەی ئەوەیش ببوایەین كە تۆ ئامادەی بوویت .

❁ كان ثابت البنانـــي رَحِمَهُ اللّٰهُ إذا رأى أنس بن مالك خادم النبـــي (ﷺ) أقبل على أنس وقَبَّل يده ويقول: إنَّـــها يد مـــست يد رسول الله (ﷺ) ، وكذلك فعل يَحيَى بن الـــحارث رَحِمَـــهُ اللّٰهُ مع واثلة بن الأسقع (رضي الله عنه) ، وبعض التابعين مع ســـلمة بـــن الأكوع (رضي الله عنه) ، فقبَّلوا اليد التـــي بايعت رسول الله (ﷺ) .

واتـە : كاتێك كە (ثابت البنانـــي) ڕەحمەتی خوا لێبێت (أَنَس)ی كـوڕی (مَالِـــك)ی خزمـەتكاری پێغەمبـەری (ﷺ) دەبـینی ڕوویدەكردە (أَنَس) و ماچـی دەسـتی دەكـرد و دەیفـەرموو : ئەمــە دەســـتێكە بـــەر دەســـتی پێغەمبـــەری خـــوا (ﷺ) كەوتووەوە ، وە (يَحيَى بن الـــحارث)یش ڕەحمەتی خوا لێبێت

هەمان کاری کردووە لەگـەڵ (واثلة بن الأســـقع)دا (رضي الله عنه) ، وە هەندێك لە (تابعين)یش هەمان کاریـان کـردووە لەگـەڵ (سلمة بن الأكـــوع)دا (رضي الله عنه) ، ماچـی ئـەو دەسـتەیان کـردووە کـە بەیعەت و پەیمانیداوە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) .

❁ وە کاتێـك کـە (الـــحسن البصري) رەحمـەتی خـوا لێبێـت بەسەرهاتی ئەو قەدە دارخورمایەی دەگێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتاری لەسەرداوە و پاشان وازی لـێهێنا و مینبەری دانـا و ئـەو قـەدەش ناڵانـدی و سـۆز و پەرۆشـی دەربـڕی و دەنگێکـی لێـوە بیـسترا وەکـو دەنگـی وشـترێکی ئـاوس کـە بێـچوەکەیی لـــێدابڕێت تــاوەکو هـــەموو ئەوانـــەی لـــەناو مزگـەوت بـوون ئـەو دەنگـەیان بیـست و پێغەمبـەریش (ﷺ) هـــات و دەســـتی خـــستەسەری و ئـــەویش هێـــور و ئـــارام بوویەوە[1] ، کاتێك کە (الـــحسن البصري) ئەم فەرموودەیەی دەگێڕایـەوە دەیفـەرموو : (يَا عِبَادَ اللَّهِ الْخَشَبَةُ تَحِنُّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) شَوْقًا إِلَيْهِ لِمَكَانِهِ مِنَ اللهِ فَأَنْتُمْ أَحَقُّ أَنْ تَـــشْتَاقُوا إِلَـــى لِقَائِهِ) واتە : ئـەی عەبـدەکانی خـوا درەختێـك لـە پەرۆشـیدا

---

[1] صحيح البخاري رقم : (٣٣٩٢) .

دەناڵێنێت بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبەر پێگەی پێغەمبەر (ﷺ) بەلای خواوە كەواتە ئێوە شایستەترن بەوەی كە پەرۆش و شەیدای گەیشتن بن بەو پێغەمبەرە (ﷺ) .

۞ وە حاڵ و باری تابعین و شوێنكەوتوان تەنها لە ئاست خۆشەویستی و پەرۆشی و تامەزرۆیی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) نەوەستاوە و بەس بەڵكو ئەمە تێپەڕبووە بۆ كردەوەكردن بە سوننەتەكانی و چاولێكردنی تاوەكو بگەن بەوەی كە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) لەدەستیان چووە :

(أبو مسلم الخولاني) كە سەردار و سەرگەورەی تابعین و شوێنكەوتوانە رەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی : (أَيَظُنُّ أَصْحَابُ مُحَمَّد (ﷺ) أَنْ يَسْتَأْثِرُوا بِهِ دُونَنَا ، فَوَاللَّه لَنُزَاحِمَنَّهُمْ عَلَيهِ زِحَامًا حَتَّى يَعْلَمُوا أَنَّهُمْ قَدْ خَلَّفُوا وَرَائِهِمْ رِجَالًا) .

واتە : ئایا صەحابەكانی (مُحَمَّد ﷺ) وادەزانن كە ئەوان پێغەمبەریان بۆ خۆیان قۆرخ كردووە جگە لە ئێمە ، سوێند بە خوا شانبەشانیان لەگەڵا دەكەین لەسەری تاوەكو بزانن كە ئەوان لە پاش خۆیان پیاوانیان بەجێهێشتووە .

بەڕاستی (أبو مسلم) ئەوەی ڕەتكردووەتەوە كە صەحابە

بەڕێزەکان (رضي الله عنهم أجمعين) پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ خۆیان قـۆرخ بکـەن و ویـستویەتی شانبەشـان بوونیـان لەگـەڵا بکـات لـە خۆشەویـستیان بـۆ پێغەمبـەر (ﷺ) ، ئـەو تێگەیـشتووە لـە واتـــای کێبڕکـــێی شـــەرەفمەندانە و پـــەی بەمـــەبردووە و زانیویـەتی کـە لـە تاعـەت و ئـەو کارانـەی کـە پێیـان نزیـك دەبیتەوە لە خوا پێشخستن نی‌یە ، وە بەڕاسـتی پێـشکەوتن تەنها پێشکەوتنە لـە فـەزڵ و سـیفەتەکاندا ، وە هەرکەسـێك کردەوەکـەی دوای بخـات ئـەوا پـشت و ڕەچـەڵەکی پێـشی ناخات ، هـەروەك وتـراوە : (إِذَا رَأَيْتَ الرَّجُلَ يُنَافِسُكَ فِي الدُّنيا فَنَافِسْهُ فِي الْآخِرَةِ ، وَإِنْ اسْتَطَعْتَ أَلَّا يَسْبِقَكَ إِلَى اللهِ أَحَدٌ فَافْعَلْ) .

واتە : ئەگەر بينيت پياوێـك كێبڕكێـت لەگەڵـدا دەكـات لـە بـواری دونيـادا ئـەوا تـۆ كێبڕكـێی لەگەڵـدا بكـە لـە بـواری دواڕۆژدا ، وە ئەگەر توانيـت هـيچ كەسـێك پێـشت نەكـەوێت بۆلای خوا ئەوا وابكە .

۞ وە سەلەف و پێشينانی دوای ئەوانيش سوربوون لەسەر شوێنكەوتنی سوننەت لە هەموو بچووك و گەورەيەكدا ، ئەوە ئيمام (أحمد)ە رەحمەتی خوا ليبێت دەفـەرمووێت : (مَا كَتَبْـــتُ

حَدِيثًا إِلَّا وَقَدْ عَمِلْتُ بِهِ حَتَّى مَرَّ بِــي أَنَّ النَّبِــيَّ (ﷺ) احْــتَجَمَ وَأَعْطَى أَبَا طِيبَةَ دِينَارًا ، فَأَعْطَيتُ الْحَجَّامَ دِينَارًا حِينَ احْتَجَمْتُ) .

**واتە : هیچ فەرموودەیەكم نەنووسیوەتەوە ئیللا كردەوەم پێكردووە تاوەكو ئەوەم بەسەردا تێپەڕبوو كە پێغەمبەر (ﷺ) كەڵەشاخی كردووە و دینارێكی داوە بە** (أَبُو طِيبَــةَ) **، منیش كاتێك كەڵەشاخم كرد دینارێكم دا بەو كەسەی وا كەڵەشاخی بۆم كرد .**

**هەروەها** ڕەحمەتی خوا لێبێت **فەرموویەتی :** (إِنْ اسْتَطَعْتَ أَلَّا تَحُكَّ شَعْرَةً إِلَّا بِأَثَرٍ فَافْعَلْ) **واتە : ئەگەر توانیت تاڵە موویەك نەخورێنیت ئیللا بە بەڵگەی** (أَثَر)**ێكەوە نەبێت ئەوا وابكە .**

**هەموو ئەوانەش لەبەر هیچ شتێك نەبووە ئیللا لەبەر تێروتەواوبوون و كەماڵی مرۆڤبوونێتی پێغەمبەر (ﷺ) نەبێت لە هەموو شتێكدا هەروەكو چۆن** (النووي ڕەحمەتی خوا لێبێت) **فەرموویەتی :** (فإن نظرت إلى وصف هيئته (ﷺ) فجمال مــا بعده جمال ، وإن نظرت إلى أخلاقه وخلاله فكمال ما بعده كمال ، وإن نظرت إلى إحسانه وفضله على الناس جميعاً وعلى المــسلمين خصوصاً فوفاء ما بعده وفاء) .

واتە : ئەگەر سەیری وەسفی شێوە و روخساری پێغەمبەر (ﷺ) بکەیت ئەوا جوانییەکە کە جوانی تری لە پاشەوە نییە ، وە ئەگەر سەیری ئەخلاق و ئاکار و ڕەفتاریشی بکەیت ئەوا کەماڵبوونێکە کە کەماڵبوونی تری لە پاشەوە نییە ، وە ئەگەر سەیری چاکە و فەزڵیشی بکەیت بەسەر هەموو خەڵکەوە و بەسەر موسڵمانانیشەوە بە تایبەت ئەوا تێروتەواوبوونێکە کە تێروتەواوبوونی تری لە پاشەوە نییە .

وە بێگومان لە گەورەترین نیعمەتەکان ئەوەیە کە عەبد خۆشەویستی پێغەمبەری (ﷺ) بە نسیب بکرێت هەروەکو چۆن (ابن القيم ڕەحمەتی خوا لێبێت) فەرموویەتی : (فإذا صدق في ذلك – أي العبد بجمع خواطره وحديث نفسه على إرادة ربه وطلبه والشوق إليه – رُزِق محبة الرسول (ﷺ) واستولت روحانيته على قلبه فجعله إمامه ومعلمه وأستاذه وشيخه وقدوته كما جعله الله نبيه ورسوله وهادياً إليه ، فيطالع سيرته ومبادئ أمره وكيفية نزول الوحي عليه ويعرف صفاته وأخلاقه وآدابه في حركاته وسكونه ، ويقظته ومنامه ، وعبادته ، ومعاشرته لأهله وأصحابه حتى يصير كأنه معه من بعض أصحابه)[1] .

---

[1] مدارج السالكين : (٣ / ٢٦٨) .

واتە : ئەگەر عەبد ڕاستی كرد ـ لـە كۆكردنـەوەی ئـەوەی كە بە ناخ و دڵ و دەروونیدا دێت لە خوتورە و قسەی ناو دڵ و دەروون لەسەر خواستنی خـوای پـەروەردگاری و تامـەزرۆیی گەیـشتن بـە ئـەو ـ ئـەوا خۆشەویـستی پێغەمبـەری (ﷺ) بـە نسیب دەكرێت و لایەنی روحـی ئـەو پێغەمبـەرە زاڵ دەبێـت بەسەر دڵیدا و بۆیە ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) دەكات بە پێشەوا و مامۆستا و ڕابەر و چـاولێكاری خـۆی هـەروەكو چـۆن خـوای گـەورە كردوویـەتی بـە هەواڵپێـدراو و نێـردراو و پێغەمبـەر و ڕێپیشاندەر بۆلای خۆی ، لەبەر ئەمەیش چاودەخشێنێت بـە ژیاننامـە و سـەرەتای كاروبـاری ئـەو پێغەمبـەرە و چـۆنێتی دابەزینی وەحی بۆی و شارەزا دەبێت لە سیفەت و ئەخلاق و ئاكار و ئادابەكانی لە كاتەكانی جووڵە و وەستانی و هەستان و خـەوتنی و عیبـادەت و پەرسـتنی و هەڵـسوكەوتی لەگـەڵ خێزان و كەوسوكاری و صەحابەكانی تاوەكو وای لێـدێت كـە وەكـو لەگـەڵ پێغەمبـەردا بێـت (ﷺ) وەك هەنـدێك لــە صەحابەكانی .

❁ دەڵــێم : (هەرکەسـێك هــاوەڵێتی پێغەمبــەری (ﷺ) لەدەسـت چـووە ئـەوا بـا هـاوەڵێتی کردنـی سـوننەتەکەیی لەدەست نەچێت) .

ئای چەند جوانە ڕۆژێك لەگـەڵ خۆشەویـستەکەتدا (مُحَمَّد ﷺ) ژیانـت بگوزرێنیـت ، چاوی لــێبکەیت لـە هــەموو ئـەو شتانەی کە دەیلێت و دەیانکات ، وە شـوێن ڕێبـاز و ئاکـاری ئەو بکەویت لە هەموو شتێکدا ، وە هەست بە بەختەوەرییەك بکـەیت کـە سـەرتاپای دڵ و دەروون و لەشـت بگرێتـەوە .. چۆن ئەمەت دەست ناکەوێت ؟؟ لە کاتێکدا کـە تـۆ شـوێنی باشـترینی بوونـەوەر دەکـەویت و چـاوی لــێدەکەیت وەکـو ئەوەی کە لە پێـشتدا بێـت و بیبینیـت .. تـاقی بکـەرەوە .. ئەو کاتە ئەمە دەبینیت ، وە ئاواتەخوازم کە لە پـاش ئـەوە هــەموو ڕۆژەکـانی تریـشت لەگـەڵ خۆشەویـستەکەتدا بیـت (مُـــحَمَّد ﷺ) .



## ۞ تێبینییەك :

دروست نـیـە ڕۆژێـك تایبـەت بكـەیت لەبـەر باوەڕبوونـت بەوەی كە فەزڵێكی تایبەتی هەیە كە لە دەقەكاندا نەهاتووە ، بـەڵام خـۆت ڕۆژێـك هەڵبـژێرە بـۆ ئـەوەی كـە بیكـەیت بـە سەرەتای هاوەڵێتی كردنت بۆ پێغەمبەر (ﷺ) إِنْ شَاءَ اللَّه .

وە پـــێش ئـــەوەی لەگـــەڵ ڕۆژێكـــی پێغەمبـــەردا (ﷺ) بەڕێكـەوین پێویـستە شـارەزا بـبین لــە شـێوە و سـیفەتە دروستكردەییەكانی پێغەمبەر (ﷺ) .



# سیفەتە دروستکردەییەکانی پێغەمبەر (ﷺ)
# (صِفَةُ خَلْقِهِ ﷺ)

پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بـاڵای مامناوەنـد بـووە لـە نێـوان درێژبوون و کورتبووندا* ، نێـوان هـەردوو شـانی لـە یەکـەوە دوور بـووە** ، قـژێکی هـەبوو دەگەیـشتە نەرمـەی هـەردوو گوێی ، وە روومـەت و روخـساری لـە هـەموو خـەڵك جـوانتر بووە و لە هەموو خەڵکیش ئەخلاق و ڕەوشت جوانتر بووە[١] ، نە درێژباڵایەکی ئاشکرا و نەکورتەباڵاش بـووە* ، وە نـە زۆر سـپی پێـست و نـە ڕەش ئەسمـەریش بـووە ، وە قـژ و مووەکانیـشی نـە زۆر قـژلول و نـە زۆر قـژخاو و نـەرم بـووە بەڵکو لە نێوان ئەوەدا بووە[٢] ، وە روومەت و روخـساری لـە هەموو خەڵك جوانتر بووە و رووم‌ـەت سـپی و جـوان بـووە[٣] وەکو ئەوەی کە بە زیو ڕەنگ کرابێت وابووە[٤] ، وە ڕەنگـی

---

* واتە : نە درێژ و نە کورتە باڵا بووە ، بەڵکو کەسێکی باڵابەرز بووە .

** واتە : کەسێکی نێوشان پان بووە .

[١] صحيح البخاري رقم : (٣٣٥٦) .

[٢] صحيح البخاري رقم : (٣٣٥٥) .

[٣] صحيح مسلم رقم : (٦٠٢٥) .

[٤] سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٠٥٣) .

پرشنگدار و درەوشاوە و جـوان بـووە ، وە دڵۆپـەی ئـارەقی وەكو مرواری وابووە[(١)] ، وە مووی ڕیشی زۆر بووە[(٢)] .

وە پرسیاركراوە لە (جَابِر)ی كوڕی (سَـــمُرَةَ) (رضي الله عنه) : ئایا روومەت و روخساری پێغەمبەر (ﷺ) وەكو شمشێر بـووە* ؟ ئـەویش فـەرمووی : بـەڵكو روخـساری وەكـو خـۆر و مـانگ وابووە و ڕوومـەتی خـڕ و بازنـەیی بـووە[(٣)] ، وە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەمـی گـەورە بـووە ، وە سـپیاییەكەی چـاوی سوورییەكی كەمی تێدا بووە ، وە پاژنەكانیشی گۆشتی كـەم بووە[(٤)] ، وە سپی پێست و ڕەنگ جوان و درەوشاوە بووە و لەش و لاری مامناوەند بووە[(٥)] نە قەڵـە و نـە لـەڕولاواز و نـە درێژ و نە كورتـە بـاڵا بـووە ، وە هـەردوو دەسـت و هـەردوو پـێی گەورە و توند و تۆڵ و قـایم بوونـە و هـەردوو لەپـیشی پان و كراوە بوونە[(٦)] .

---

(١) صحيح مسلم رقم : (٦٠٠٨) . (٢) صحيح مسلم رقم : (٦٠٣٧) .

* واتە : ئایا وەكو شمشێر درەوشاوەتەوە ؟ ئەویش فەرمووی : بەڵكو روومەتی وەكو خۆر و مانگ درەوشاوەتەوە و روومەتی خڕ و بازنەیی بووە نەك باریك بێت وەكو شمشێر .

(٣) صحيح مسلم رقم : (٦٠٣٧) . (٤) صحيح مسلم رقم : (٦٠٢٤) .

(٥) صحيح مسلم رقم : (٦٠٢٦) . (٦) صحيح البخاري رقم : (٥٥٦٧) .

قَالَ أَنَسٌ (رضي الله عنه) : ((مَا مَسِسْتُ حَرِيرًا وَلَا دِيبَاجًا أَلْـــيَنَ مِـــنْ كَفِّ النَّبِـــيِّ (ﷺ) ، وَلَا شَـــمِمْتُ مِسْكًا وَلَا عَنْبَرًا أَطْيَبَ مِـــنْ رِيحِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ))[١] .

**واته : دەستم نەداوە لە هیچ حەریر و ئاورێشمێك نـەرمتر بێت لە دەست و لەپی پێغەمبەر (ﷺ) ، وە بۆنی هیچ میسك و عەنبەرێکیشم نەکردووە بۆنخۆشتر بێت لە بـۆنی پێغەمبـەری خوا (ﷺ) .**

**وە ئارەقیان لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگرتەوە و دەخرایـە نـاو شوشەیەکەوە بۆ ئەوەی ببێتە بۆنخۆشترینی بۆنەکان[٢] .**

**وە ئێستاش کاتی ڕۆیشتنە نـاو ڕۆژێکـی پێغەمبـەرە (ﷺ) بە شێوازێکی کورت و پوخت بە پشتبەستن بـەوەی ڕاسـت و دروست و (صەحیح)ــە بـەلای فەرموودەناسـی سـەردەمەوە ئیمـامی (مـــحمد ناصر الدين الألبانـــــي) بـە خۆتهـەڵهێنان لەسەر شەش کتێبەکانی فەرموودە ئیللا بە دەگمـەن نـەبێت لەبەر پێویستی .**

---

(١) صحيح البخاري رقم : (٣٣٦٨) .

(٢) صحيح البخاري رقم : (٥٩٢٥) .

## کاروکردار و ڕەفتاری پێغەمبەر (ﷺ) لە کاتەکانی : لەخەوهەستانی و دەستنوێژگرتنی و شەونوێژکردنی (هَدِيهُ ﷺ فِي اسْتِيقَاظِهِ وَوُضُوئِهِ وَقِيَامِهِ)

پێغەمبـــەری خـــوا (ﷺ) کاتێـــك کـــە بەخەبەردەهاتـــەوە لەخەوتنی دەیـووت : (الْــحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَـــا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ)[1] واتە : سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایـەی کـە زینـــدووی کردینـــەوە لـــە پـــاش ئـــەوەی کـــە مرانـــدینی و گەڕانەوەش بۆلای ئەوە .

وە بە سیواك کردن دەستی پێدەکرد[2] و هەندێك جاریش ئەمـــــەی دەخوێنـــــدەوە : ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ١٩٠﴾ تـــــــــاوەکو کۆتـایی سـورەتی (آل عمـــران)[3] ، پاشـان دەسـتنوێژێکی جوانی دەگرت[4] .

---

[1] صحيح البخاري رقم : (٥٩٥٣) .

[2] صحيح البخاري رقم : (٢٤٢) .

[3] صحيح البخاري رقم : (١٨١) و (٤٢٩٣) و (٥٨٦١) .

[4] صحيح مسلم رقم : (١٧٩١) .

وه پێغەمبەر (ﷺ) هەرکاتێك بیویستایەت بچێتە سەرئاو دەیوت : (اللَّهُمَّ إِنِّـــي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْـــخُبُثِ وَالْـــخَبَائِثِ)[١] واتە : "خوایە من پەنات پێدەگرم لە نێرینە و مێینەی شەیتانەکانی جنۆکە" ، وە کاتێکیش کە دەهاتە دەرەوە دەیوت : (غُفْرَانَكَ)[٢] واتە : "خوایە داوای لێخۆشبوونت لێدەکەم" .

وە پێغەمبەر (ﷺ) لەسەرئاو خۆیی پاکوخاوێن دەکردەوە هەندێك جار بە ئاو[٣] و هەندێك جاریش بە سێ بەرد[٤] و هەندێك جاریش هەردووکیانی کۆدەکردەوە* ، وە پێغەمبەر (ﷺ) لەو کاتەدا خۆیی پەنادەدا بۆ ئەوەی عەورەتی دەرنەکەوێت و میزیشی بە پێوە نەدەکرد[٥] مەگەر بە دەگمەن نەبێت[٦] .

---

[١] صحيح البخاري رقم : (١٤٢) وصحيح مسلم رقم : (٨٢٩) .

[٢] صحيح سنن أبـــي داود رقم : (٣٠) .

[٣] صحيح البخاري رقم : (١٥١) وصحيح مسلم رقم : (٦١٩) .

[٤] صحيح البخاري رقم : (١٥٥) .

* واتە : سەرەتا بە بەرد خۆیی پاکوخاوێن کردووەتەوە و پاشان ئاویشی بەکارهێناوە بۆ زیاتر پاکوخاوێن بوونەوە ! بەڵام ئەمە بەڵگەی لەسەر نەهاتووە ! بۆیە یان تەنها بەرد یان تەنها ئاو بەکاردەهێنرێت . وەرگێڕ

[٥] صحيح سنن النسائي رقم : (٢٩) .

[٦] صحيح البخاري رقم : (٢٢٢) .

وە كە دەستنوێژی دەگرت خۆیی دەگرتـەوە لـەوەی كـە زیادەڕەوی بكات لەبەكارهێنانی ئـاوی دەسـتنوێژ و سـەرەتا سێ جار هەردوو دەستی دەشۆرد[(١)] پاشـان سـێ جار ئـاوی ڕادەدایە ناو دەم و لووتی بە سێ مشت هـەر مـشتێك نیـوەی بـۆ دەم و نیوەكـەی تریـشی بـۆ لـووت[(٢)] ، وە بـە دەسـتی ڕاسـتی ئـاوی ڕادەدایـە نـاو دەم و لـووتی و بـە دەسـتی چەپیشی ئاوەكەی لووتی دەهێنایە دەرەوە و هنگی دەكرد ، وە فەرمانیشی دەكرد بە زیاتر ئاوڕادانە ناو لـووت ئەگـەر بـە ڕۆژوو نەبێت[(٣)] ، پاشان سێ جـار رووومـەتی دەشـۆرد[(١)] لـەو شوێنەوە كە مووەكانی سەری لـێدەڕوێت تـاوەكو ڕیـشی و هەندێك جاریش [بـە دەسـتی ڕاسـتی] ئـاوی ڕادەدایـە نـاوی ڕیـشیەوە[(٤)] ، پاشـان سـێ جـار هـەردوو قـۆڵی دەشـۆرد لـە سەرپەنجەكانیەوە تاوەكو ئانیشكەكانی (قورِنێسكەكانی)[(١)] ، وە هانیشیداوە بۆ ئەوەی كە پـەنجـەكان بكـرێن بەیەكـدا[(٥)] ، پاشـان بـە هـەردوو دەسـتی دەهێنـا بـە سـەریدا و

---

(١) صحيح البخاري رقم : (١٥٨) وصحيح مسلم رقم : (٥٣٨) .

(٢) صحيح البخاري رقم : (١٨٤) .

(٣) صحيح سنن أبـــي داود رقم : (١٤٢) .

(٤) صحيح سنن الترمذي رقم : (٢٩) .

(٥) صحيح سنن الترمذي رقم : (٣٨) .

**سەرەتا لە پێشە سەریەوە دەستی پێدەکرد تاوەکو هەردوو دەستی دەبرد تا پشتەملی و ئەنجا هەردوو دەستی دەگەڕاندەوە بۆ ئەو شوێنەی کە سەرەتا دەستی پێکرد**[١] ، **پاشان هەردوو دەستی دەهێنا بە دەرەوە و ناوەوەی هەردوو گوێی**[٢] ، **پاشان سێ جار هەردوو پێیی دەشۆرد تاوەکو هەردوو قولەپێکانی (قاپەڕەقەکانی)**[٣] ، **پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی** : ((مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ فَيُسْبِغُ الْوُضُوءَ ، ثُمَّ يَقُولُ : أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ، إِلَّا فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةِ ، يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ))[٤] **وە ئەم وتەیەشی بۆ زیاد دەکات** : ((اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنْ التَّوَّابِينَ ، وَاجْعَلْنِي مِنْ الْمُتَطَهِّرِينَ))[٥] .

**واتە : هەریەکێك لە ئێوە دەستنوێژ بگرێت دەستنوێژێکی باش و کامڵ ، پاشان بڵێت** : (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ، اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنْ التَّوَّابِينَ ، وَاجْعَلْنِي مِنْ الْمُتَطَهِّرِينَ : **شایەتی دەدەم کە هیچ**

---

(١) صحيح البخاري رقم : (١٨٣) . (٢) صحيح سنن أبـي داود رقم : (١٢٣) .

(٣) صحيح البخاري رقم : (١٥٨) وصحيح مسلم رقم : (٥٣٨) .

(٤) صحيح مسلم رقم : (٥٥٢) . (٥) صحيح سنن الترمذي رقم : (٥٥) .

**پەرستراوێك نىیە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خوا تەنهایە و بێ شەریکە ، وە شایەتیش دەدەم کە** مُحَمَّد **بەندە و پێغەمبەری خوایە ، خوایە بمکە بە یەکێك لە تەوبەکاران ، وە بمکە بە یەکێك لەوانەی کە خۆیان پاك دەکەنەوە) ئیللا هەر هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە ، لە هەرکامیان دەچێتە ژوورەوە ویستی خۆیەتی .**

**وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی :** ((إِذَا تَوَضَّأَ الْعَبْدُ الْمُسْلِمُ أَوْ الْمُؤْمِنُ فَغَسَلَ وَجْهَهُ خَرَجَ مِنْ وَجْهِهِ كُلُّ خَطِيئَةٍ نَظَرَ إِلَيْهَا بِعَيْنَيْهِ مَعَ الْمَاءِ أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ ، فَإِذَا غَسَلَ يَدَيْهِ خَرَجَ مِنْ يَدَيْهِ كُلُّ خَطِيئَةٍ كَانَ بَطَشَتْهَا يَدَاهُ مَعَ الْمَاءِ أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ ، فَإِذَا غَسَلَ رِجْلَيْهِ خَرَجَتْ كُلُّ خَطِيئَةٍ مَشَتْهَا رِجْلَاهُ مَعَ الْمَاءِ أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ ، حَتَّى يَخْرُجَ نَقِيًّا مِنْ الذُّنُوبِ))[١] .

**واتە : ئەگەر عەبدی موسڵمان یان ئیماندار دەستنوێژیگرت و روخساری شۆرد ئەوا هەموو ئەو هەڵە و گوناهانەی کە بە هۆی سەیرکردنی هەردوو چاوەکانیەوە کردوونی لەگەڵ ئاوەکەدا یان لەگەڵ کۆتا دلۆپەی ئاوەکەدا دەردەچن ، وە**

---

[١] صحيح مسلم رقم : (٥٧٦) .

کاتێك کە هـەردوو دەستەکانی دەشۆرێت ئـەوا هـەموو ئـەو هەڵە و گوناهانـەی کـە بـە هـەردوو دەستەکانی دەستی بـۆ بردوون لەگەڵ ئاوەکەدا یان لەگـەڵ کۆتـا دڵۆپـەی ئاوەکـەدا دەردەچن ، وە کاتێك کە هەردوو پێیەکانی دەشۆرێت ئـەوا هـەموو ئـەو هەڵـە و گوناهانـەی کـە بـە هـەردوو پێیـەکانی هەنگاوی بۆ ناوون لەگەڵ ئاوەکەدا یان لەگەڵ کۆتـا دڵۆپـەی ئاوەکەدا دەردەچـن ، تـاوەکو بـە پـاكوخـاوێنی لـە تـاوان و گوناهەکان دەردەچێت .

وە پێغەمبـەر (ﷺ) لـە شـەودا یـانزە رکعـات شـەونوێژی دەکرد ، چـوار رکعـاتی دەکـرد پرسـیار مەکـە سـەبارەت بـە درێژی و جوانی و چاك ئەنجامدانیان ، پاشـان چـوار رکعـاتی تریشی دەکرد پرسیار مەکە سەبارەت بە درێـژی و جـوانی و چاك ئەنجامدانیان ، پاشان سێ رکعات ویتریـشی دەکـرد[1] ، وە هەنـدێك جـاریش سـیانزە رکعـاتی دەکـرد[2] ، پاشـان ڕادەکـشا تـاوەکو بانگـدەری نوێـژ دەهاتـەلای و ئـەو کاتـە

---

[1] صحيح البخاري رقم : (٣٣٧٦) وصحيح مسلم رقم : (١٧٢٠) .

[2] صحيح البخاري رقم : (١١١٧) .

هەڵدەسا دوو ركعاتی سووك و كورتی دەكرد كە بریتی بـوون لــە دوو ركعاتــە ســوننەتەكەی بــەیانیان[1] ، وە لــەو دوو ركعاتــەدا هــەردوو ســورەتی (الكـــافرون) و (الإخـــلاص)ی دەخوێند[2] ، وە هەندێك جاریش ئـەو ڕاكشانەی لەسـەر لای ڕاستی دەخستە پاش دوو ركعاتە سوننەتەكەی بەیانیان[3] .



(١) صحيح البخاري رقم : (١٨١) وصحيح مسلم رقم : (١٧١٤) .

(٢) صحيح مسلم رقم : (١٦٨٧) .

(٣) صحيح البخاري رقم : (٦٠٠) وصحيح مسلم رقم : (١٧١٥) .

# كاروكردار و ڕەفتاری پێغەمبەر (ﷺ) لە کاتی : بیستنی بانگ و ڕۆیشتن بۆ مزگەوت

# (هَدِيهُ ﷺ عِنْدَ سَمَاعِ الأَذَانِ وَالذَّهَابِ لِلْمَسْجِدِ)

وە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك کە گوێی لە بانگدەر دەبوو وەکو ئەوەی دەوتەوە کە ئەو دەیوت تاوەکو دەگەیشتە (حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ) ئەو کاتە دەیوت : (لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ)[1] ، وە هەواڵیشیداوە بەوەی کە هەرکەسێك لە دڵیەوە ئەوە بڵێت ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە[2] ، وە فەرمانیشی کردووە بە صەلاواتدان لەسەری لە پاش بانگدان[3] .

وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ : "**اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ ، وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ**" حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ))[4] .

---

[1] مسند الإمام أحمد رقم : (٢٣٨٦٦) وصححه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٠٧٥) .

[2] صحيح مسلم رقم : (٨٤٨) .

[3] صحيح مسلم رقم : (٨٤٧) .

[4] صحيح البخاري رقم : (٥٨٩) .

واتە : هەركەسێك كاتێك كە گوێی لە بانگ دەبێت بڵێت : ("**اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ ، وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ**" / ئەی ئەو خوایەی كە خاوەنی ئەم بانگەوازە تێروتەسەل و تەواوە و ئەم نوێژە دابەستراوەیت پلە و پێگەی وەسیلە و فەزیلە ببەخشە بە (مُحَمَّــــد) و بیشیگەیەنە بەو پێگە ستایشكراوەی كە وەعد و بەڵێنت پێیداوە) ئەوا تكا و شەفاعەتی منی بۆ مسۆگەر دەبێت لە ڕۆژی قیامەتدا .

**هەروەها پێغەمبەر** (ﷺ) **فەرموویەتی** : ((مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ الْمُؤَذِّنَ : "**أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ، رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا ، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولًا ، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا**" غُفِرَ لَهُ ذَنْبُهُ))[١] .

واتە : هەركەسێك كاتێك كە گوێی لە بانگدەر دەبێت بڵێت : (**أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ، رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا ، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولًا ، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا** / شایەتی دەدەم بەوەی كە هیچ

---

[١] صحيح مسلم رقم : (٨٤٩) .

پەرستراوێك نیيە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خوا تەنهایە و بێ شەریکە ، وە بەڕاستی (مُحَمَّـد)یش بەندە و پێغەمبەری خوایە ، ڕازیم بەوەی کە (ٱللَّهُ) پەروەردگارمە و (مُحَمَّد ﷺ) پێغەمبەرمە و ئیسلامیش ئاینمە) ئەوا خوا لە تاوانەکانی خۆشدەبێت .

پاشان پێغەمبەر (ﷺ) دەردەچوو بۆ نوێژ و لە کاتی ڕۆیشتنیشیدا بۆ مزگەوت دەیوت : **(اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُورًا ، وَفِي لِسَانِي نُورًا ، وَفِي سَمْعِي نُورًا ، وَفِي بَصَرِي نُورًا ، وَمِنْ فَوْقِي نُورًا ، وَمِنْ تَحْتِي نُورًا ، وَعَنْ يَمِينِي نُورًا ، وَعَنْ شِمَالِي نُورًا ، وَمِنْ بَيْنِ يَدَيَّ نُورًا ، وَمِنْ خَلْفِي نُورًا ، وَاجْعَلْ فِي نَفْسِي نُورًا ، وَأَعْظِمْ لِي نُورًا)**[1] .

واتە : خوایە ڕووناکی بخەرە ناو دڵمەوە ، وە ڕووناکی بخەرە ناو زمانمەوە ، وە ڕووناکی بخەرە ناو بیستنمەوە ، وە ڕووناکی بخەرە ناو بینینمەوە ، وە ڕووناکی بخەرە سەرەوەم ، وە ڕووناکی بخەرە خوارەوەم ، وە ڕووناکی بخەرە لای ڕاستەوەم ، وە ڕووناکی بخەرە لای چەپەوەم ،

---

[1] صحيح مسلم رقم : (١٧٨٥) .

وە رووناكی بخەرە پێشەوەم ، وە رووناكی بخەرە پاشەوەم ، وە رووناكی بخەرە ناو خۆمەوە ، وە خوایە رووناكیم بۆ گەورە بكە .

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((بَشِّرْ الْمَشَّائِينَ فِي الظُّلَمِ إِلَى الْمَسَاجِدِ بِالنُّورِ التَّامِّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ))[١] .

واتە : مژدە بدە بەو كەسانەی كە لە تاریكیدا دەڕۆن بۆ مزگەوتەكان بە رووناكی تەواو لە ڕۆژی قیامەتدا .

وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) كاتێك كە دەڕۆیشتە ناو مزگەوتەوە پێی ڕاستی پێش دەخست و ئەنجا دەیوت : (**أَعُوذُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ وَبِوَجْهِهِ الْكَرِيمِ وَسُلْطَانِهِ الْقَدِيمِ مِنْ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ**)[٢] .

واتە : پەنادەگرم بە خوای گەورە و بە روخساری پیرۆزی و بە دەسەڵاتی دێرینی لە شەیتانی دەركراو لە رەحمەتی .

هەروەها كاتێك كە دەڕۆیشتە ناو مزگەوتەوە دەیوت : (**بِسْمِ اللَّهِ وَالسَّلَامُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي**

---

[١] صحيح سنن أبـــي داود رقم : (٥٦١) .

[٢] صحيح سنن أبـــي داود رقم : (٤٦٦) .

**وَافْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ** / بـەناوی خـواوە و سـەلام لەسـەر پێغەمبەری خوا ، خوایە لە تاوانەکانم خۆشبە و دەرگاکـانی رەحمەتی خۆتم بۆ بکەرەوە .

وە کـاتێکیش کـە دەڕۆیـشتە دەرەوە لـە مزگـەوت پـێی چەپی پێش دەخـست و ئـەنجا دەیـوت : (**بِسْمِ اللَّـهِ وَالسَّلَامُ عَلَـى رَسُـولِ اللَّـهِ ، اللَّهُـمَّ اغْفِـرْ لِـي ذُنُـوبِي وَافْـتَحْ لِـي أَبْـوَابَ فَضْلِكَ** / بەناوی خـواوە و سـەلام لەسـەر پێغەمبـەری خـوا ، خوایە لـە تاوانـەکانم خۆشـبە و دەرگاکـانی فـەزڵ و چـاکەی خۆتم بۆ بکەرەوە)[1] .

هەروەها لە کاتی ڕۆیشتنە دەرەوە لە مزگـەوت هانیـداوە بۆ وتنی : (**اللَّهُمَّ اعْصِمْنِي مِنْ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ**)[2] .

واتە : خوایە بمپارێزە لە شەیتانی دەرکراو لە رەحمەت و میهرەبانی .



(١) صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٧٧١) .
(٢) صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٧٧٣) .

## كاروكردار و ڕەفتاری پێغەمبەر (ﷺ) لە نوێژدا :

## (هَدِيهُ ﷺ فِي الصَّلَاة)

نوێژ ئۆقرەی چاوەكان و مایـەی ئـارامی و هانـابۆلابراوی پێغەمبەری خـوا (ﷺ) بـوو لـە كـاتی ناڕەحـەتی و بارودۆخـە ناهەموارەكانــدا[١] ، وە پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) كاتێــك كــە هەڵدەسا بـۆ نوێـژ نـاو دەمـی پـاك و خـاوێن دەكـردەوە بـە سیواك[٢] ، وە ڕووەو بەربەستێك (سُـــتْرَة) نوێـژی دەكـرد و لێیشی نزیـك دەبوویـەوە[٣] ، وە حەربەیـەكی لـە پێـشەوەی خۆی وەكـو بەربەسـتێك (سُتْرَة) دادەنـا و ڕووەورووی نوێـژی دەكرد[٤] ، وە فەرمانیشی كردووە بە نوێژگـەر كـە نـەهێڵێت هیچ كەسێك لە پێشەوەی تێپەڕببێت و فەرمانیـشی كـردووە بە پاڵپێوەنانی[٥] .

---

[١] صحيح سنن أبـــي داود رقم : (١٣٢١) و (٤٩٨٨) .

[٢] صحيح البخاري رقم : (٢٤٢) .

[٣] صحيح البخاري رقم : (٤٧٤) وصحيح مسلم رقم : (١١٣٤) .

[٤] صحيح مسلم رقم : (١١١٥) .

[٥] صحيح مسلم رقم : (١١٢٨) .

وه پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕووی دەكرد لە قیبلـە و پاشـان دەیـوت : (اللَّهُ أَكْبَر)[١] و هــەردوو دەسـتی بـەرز دەكـردەوە تاوەكو كنارەكانی هەردوو گوێی و لە ئاست هەردوو شانی و پەنجەكانی دەكردەوە و ناوەوەی هەردوو دەستی ڕوودەكرد لە قیبلە[٢] ، پاشان ناو لەپی دەسـتی ڕاسـتی دەخـستەسەر پشتی دەستی چەپی و لەسەر سنگی دایدەنا[٣] ، وە سەیری شوێنی سوجدەكەیی دەكرد ـ وە چاوی لە شوێنی سوجدەكەی تێنەدەپەڕاند تاوەكو لە نوێژەكەی دەبوویـەوە[٤] ـ ، پاشـان نوێژەكەیی دەستپێدەكرد و دەیوت : (اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِــي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ ، اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِــنْ خَطَايَايَ كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ مِنْ الدَّنَسِ ، اللَّهُمَّ اغْسِلْنِي مِنْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ[٥] / خوایە نێوان مـن و تاوانـەكانم دوور بخەرەوە هـەروەكو چـۆن نێـوان ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئـاوات

---

[١] صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٨٠٣١) .

[٢] صحيح مسلم رقم : (٨٥٩) و (٨٦٤) .

[٣] صحيح سنن أبــي داود رقم : (٧٥٩) .

[٤] السنن الكبرى للبيهقي رقم : (١٠٠٠٨) ومستدرك الــحاكم رقم : (١٧٦١) وانظــر صــفة صــلاة النبــي (ﷺ) للألبانــي ص : (٨٩) .

[٥] صحيح البخاري رقم : (٧١١) .

دوور خستووەتەوە ، خوایە پاكم بكەرەوە لە تاوانەكانم هەروەكو چۆن جلێكی سپی پاك وخاوێن دەكرێتەوە لە چڵك و لەكە و پەڵە ، خوایە بمشۆ لە تاوانەكانم بە ئاو و بەفر و تەرزە) .

وە پێغەمبەر (ﷺ) پەنای دەگرت بە خوا و دەیوت : (أَعُوذُ بِاللَّهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنْ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْخِهِ وَنَفْثِهِ[1] / پەنا دەگرم بە خوای بیسەر و زانا لە شەیتانی دەركراو لە رەحمەتی خوا لە وەسوەسەی و توشكردنی بە خۆبەگەورەزانی و شیعری خراپ) ، پاشان (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)ی دەخوێند و دەنگی پێ هەڵنەدەبڕی[2] ، وە كاتێك كە (فاتیحەی) دەخوێند ئایەت ئایەت دەیپچڕاند و دەیوت : ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ ئەنجا دەوەستا و پاشان دەیوت : ﴿ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ ئەنجا دەوەستا و پاشان دەیوت : ﴿ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴾ ئا بەو شێوازە تاوەكو كۆتایی

---

[1] صحيح سنن أبـي داود رقم : (٧٧٥) .

قوله : (مِنْ هَمْزِهِ) : أي : وسوسته ، وقيل : إصابته بالجنون ، (وَنَفْخِهِ) : أي الكبر كأنَّ الشيطان ينفخ فيه بالوسوسة فيُعظِّمه في عينه ويُحقِّر الناسَ عنده ، (وَنَفْثِهِ) أي : الشعر المذموم .

[2] صحيح البخاري رقم : (٧١٠) وصحيح مسلم رقم : (٨٨٨) .

سورەتەکە ، وە هەموو قورئان خوێندنەوەی پێغەمبەر (ﷺ) ئاوەها بوو لەسەر هەموو ئایەتەکان ڕادەوەستا و نەیدەگەیاند بە ئایەتەکەی پاش خۆی[1] ، وە لە خوێندنەوەکەیدا پیتەکانی درێژکردنەوەی درێژدەکردەوە[2] ، وە کاتێك کە کۆتایی دەهێنا بە خوێندنەوەی (فاتیحە) دەیوت : (آمِـــین / خوایە وەڵامی دوعاکانم بدەرەوە) و دەنگی پێ هەڵدەبڕی و دەنگیشی پێ درێژدەکردەوە[3] ، وە هەواڵیشیداوە بەوەی کە هەرکەسێك (آمِـــین) وتنەکەی یەکانگیرببێتەوە لەگەڵ (آمِين) وتنی فریشتەکان ئەوا خوا لە تاوانەکانی پێشووی خۆشدەبێت[4] .

وە پێغەمبەر (ﷺ) لە پاش (فاتیحە) لە نوێژی بەیانیاندا لە سورەتەکانی (طِوَالُ الْمُفَـــصَّل)ی* دەخوێند لە (سُـــورَة ق)ـەوە تاوەکو (سُورَة الْمُرْسَـــلَات) ، وە شەست بۆ سەد

---

[1] صحيح سنن أبـــي داود رقم : (٤٠٠٣) .

[2] صحيح البخاري رقم : (٤٧٥٨) .

[3] رواه البخاري في جزء "القراءة خلف الإمام" رقم : (١٤٤) .

[4] صحيح البخاري رقم : (٧٤٧) .

* (سُـــمِّيَ الْمُفَصَّلَ لِكَثْرَةِ انْفِصَالِ سُـــــوَرِهِ) واتە : ناونراوە بە (الْمُفَـــصَّلَ) لەبەر زۆری لەیەك دابڕانی سورەتەکانی .

ئایەتی تێدا دەخوێندەوە[١] ، وە هەندێك جاریش لە جگە لـە سـورەتەکانی (الْمُفَـــصَّل)ی تیـدا دەخوێنـدەوە[٢] ، وە لـە بـەیانیانی جومعـەدا لـە رکعـاتی یەکەمـدا سـورەتی (﴿الٓمٓ ، تَنزِيلُ ﴾ الـــسَّجْدَة)ی دەخوێنــد و لــە رکعــاتی دووەمیــشدا سورەتی (﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ ﴾)ی دەخوێند[٣] .

وە لە نوێژی نیوەڕۆیـشدا لـە دوو رکعـاتی یەکەمیانـدا لـە هــەر رکعاتێکـدا ئەنـدازەی سـی ئایــەتی دەخوێنـد ، وە لــە دووەکـەی کۆتاییـشدا لــە هــەر رکعاتێکـدا ئەنـدازەی پــانزە ئایەت یان نیوەی ئەو سیەی دەخوێند .

وە لە نوێژی عەسریشدا لە دوو رکعاتی یەکەمیاندا لە هەر رکعاتێکــدا ئەنــدازەی پــانزە ئایــەتی دەخوێنــد ، وە لـــە دووەکەی کۆتاییشدا ئەندازەی نیوەی ئەوەی دەخوێند[٤] .

وە هەنـدێك جـاریش لــە دوو رکعــاتی کۆتــایی نیــوەڕۆ و عەسردا خوێندنەوەکـەیی کورت هــەڵدەهێنـا لەسەر خوێندنی

---

[١] صحيح البخاري رقم : (٥٢٢) وصحيح مسلم رقم : (١٤٦٠) .

[٢] صحيح مسلم رقم : (١٠٢٣) .

[٣] صحيح البخاري رقم : (٨٥١) .

[٤] صحيح مسلم رقم : (١٠١٣) .

**(فاتيحه) ، وه هەندێك جار ئايەتەكانی دەدا بە گوێياندا**[(١)] **.**

**وە لـە نوێـژی مەغريبـدا هەنـدێك جـار لـە سـورەتەكانی (قِصَارُ الْمُفَصَّلِ)ی دەخوێنـد**[(٢)] **لـە (سُورَةَ الضُّحَى)وە تـاوەكو (سُورَةَ النَّــاس) ، وە هەنـدێك جـاريش لـە جگـە لـە (قِــصَارُ الْمُفَصَّلِ)ی دەخوێند وەكو (الطُّور)**[(٣)] **و (الْأَعْرَاف)**[(٤)] **.**

**وە لــە نوێـژی عيشايـشدا لــە سـورەتەكانی (أَوَاسِـــطُ الْمُفَصَّلِ)ی دەخوێنـد**[(٥)] **[لـە (سُورَةُ النَّبَأ)وە تـاوەكو (سُــورَة اللَّيل)] .**

**وە كاتێـك كـە لـە خوێندنـەوەی قورئانەكـە دەبوويـەوە هەردوو دەستی بـەرز دەكردەوە و دەيـوت (اللَّـــهُ أَكْبَـــر) و ركوعی دەبرد**[(٦)] **، وە هەردوو لەپی لەسـەر هـەردوو ئـەژنۆی دادەنا**[(٧)] **وەكو ئەوەی كـە مـشتی پێيانـەوە گرتبێـت**[(٨)] **، وە نێوان پەنجەكانيشی دەكردەوە**[(٩)] **، وە هەردوو ئانيشكەكانی**

---

(١) صحيح البخاري رقم : (٧٤٣) وصحيح مسلم رقم : (١٠١١) .

(٢) صحيح سنن النسائي رقم : (١٠٥٤) و (١٠٥٥) .

(٣) صحيح البخاري رقم : (٧٣١) .

(٤) صحيح البخاري رقم : (٧٣٠) .

(٥) صحيح سنن النسائي رقم : (١٠٥٤) .

(٦) صحيح البخاري رقم : (٧٠٥) .

(٧) صحيح البخاري رقم : (٧٩٤) .

(٨) صحيح سنن أبــي داود رقم : (٧٢٠) .

(٩) صحيح سنن أبــي داود رقم : (٧٣١) .

دووردەخستەوە لە هەردوو لاكەلەكەی[١] ، وە پشتی ڕادەخست و ڕێك وراستی دەكرد[٢] ، وە سەری بەرز نەدەكردەوە و خواریشی نەدەكردەوە بەڵكو لەو نێوەندەدا بوو[٣] ، وە سێ جار دەیوت : (سُبْحَانَ رَبِّـيَ الْعَظِيم)[٤] ، وە هەندێك جاریش زیاتر لەوە دووبارەی دەكردەوە و هەندێك جاریش بۆی زیاد دەكرد و دەیوت : (سُبُّوحٌ قُدُّوسٌ رَبُّ الْمَلَائِكَةِ وَالرُّوح)[٥] ، هەروەها دەیوت : (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي)[٦] و لە ركوع و سوجدەبردنیدا ئەم دوعایەی زۆر دەوتەوە ، وە پێغەمبەر (عَلَيهِ الصَّلَاةِ وَالسَّلَام) فەرموویەتی : ((أَلَا وَإِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَقْرَأَ الْقُرْآنَ رَاكِعًا أَوْ سَاجِدًا ، فَأَمَّا الرُّكُوعُ فَعَظِّمُوا فِيهِ الرَّبَّ ، وَأَمَّا السُّجُودُ فَاجْتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ فَقَمِنٌ أَنْ يُسْتَجَابَ لَكُمْ))[٧] واتە : بزانن من ڕێگریم لێكراوە لە كاتی ركوع و سوجدەبردندا قورئان بخوێنم ، لە ركوعدا خوای پەروەردگاری تێدا گەورەڕاگرن ، وە لە

---

(١) صحيح سنن أبـي داود رقم : (٧٣٤) .

(٢) صحيح البخاري رقم : (٧٩٤) .

(٣) صحيح مسلم رقم : (١١١٠) .

(٤) صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٨٨٨) .

(٥) صحيح مسلم رقم : (١١١٩) .

(٦) صحيح البخاري رقم : (٧٦١) .

(٧) صحيح مسلم رقم : (١٠٧٤) .

سوجدەیـــشدا زۆر دوعابكـــەن و بپاڕێنـــەوە چـــونكە شـــیاوی ئەوەیە كە وەڵامبدرێنەوە .

پاشان پێغەمبەر (ﷺ) پشتی لە ركوع بـەرز دەكـردەوە و دەیـوت : (سَـــمِعَ اللَّـــهُ لِمَـــنْ حَمِـــدَه) و لـە كـاتی پـشت ڕاستكردنەوەكەشیدا هەردوو دەسـتی بـەرز دەكـردەوە ، وە كە پشتی ڕاست دەبوويەوە بەڕاوەستانەوە دەیـوت : (رَبَّنَـــا وَلَكَ الْحَمْد)[1] و هەندێك جاریش بە بـێ پیتـی (وَ) و هەنـدێك جاریش وشەی (اللَّهُمَّ)ـەشی پێش دەخست لەگەڵ پیتـی (وَ) و هەندێك جاریش بە بـێ پیتـی (وَ)[2] ، وە پێغەمبـەر (عَلَيـــهِ الصَّلَاةِ وَالسَّلَام) فەرموویەتی : ((إِذَا قَالَ الْإِمَامُ "سَمِعَ اللَّـــهُ لِمَـــنْ حَمِدَهُ" فَقُولُوا : "اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ" فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ قَوْلُهُ قَوْلَ الْمَلَائِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ))[3] واتـە : كاتێـك پێـشنوێژ وتی (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَه) ئێـوەیش بڵـێن : (اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَـــكَ الْحَمْـــــد) چـــونكە بەڕاســـتی هەركەســـێك ئـــەم وتەیـــەی یەكانگیرببێتـــەوە لەگـــەڵ وتـــەی فریـــشتەكان ئـــەوا خـــوا لـــە تاوانەكانی پێشووی خۆشدەبێت ، وە بێدەنگیش بـووە لـەو

---

[1] صحيح البخاري رقم : (٧٥٦) .

[2] صحيح البخاري رقم : (٤٢٨٤) .

[3] صحيح البخاري رقم : (٧٦٣) .

كەسەی كە لە پاش ئەوە وتویەتی : (حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ) و فەرموویەتی : ((رَأَيْتُ بِضْعَةً وَثَلَاثِينَ مَلَكًا يَبْتَدِرُونَهَا أَيُّهُمْ يَكْتُبُهَـــا أَوَّلُ))[1] واتــە : ســی و شــەش فریــشتەم بینــی دەستپێشخەریان دەكرد كامیـان یەكـەم كـەس بینووسێت ، وە هەندێك جار ئەمەشی بۆ زیاد دەكرد : (مِــلْءَ الــسَّمَوَاتِ وَمِلْءَ الْأَرْضِ ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ)[2].

پاشـان دەیـوت (اللَّـــهُ أَكْبَـــر) و دادەبـەزی و سـوجدەی دەبرد[3] ، وە لووت و توێڵی (نێوچاوانی) جـێگیر دەكـرد لـە زەوی[4] ، وە خـــۆیی دەدا بەســـەر هـــەردوو لەپیـــدا و رایدەخستن[5] ، وە پەنجەكانی هەردوو دەستی یەكدەخست و روویـانی دەكـرد رووەو قیبلـە[6] ، وە هــەردوو دەسـتی لــە ئاستی هەردوو شانی دادەنا[7] و هەندێك جـاریش لـە ئاسـتی هــەردوو گــوێی[8] ، وە هــەردوو ئــەژنۆی و سـنگی هــەردوو پــێی جــێگیر دەكــرد لــە زەوی[9] ، وە ســەرپەنجەكانی

---

[1] صحيح البخاري رقم : (٧٦٦) .
[2] صحيح مسلم رقم : (١٠٦٧) .
[3] صحيح البخاري رقم : (٧٧٠) .
[4] صحيح سنن أبـــي داود رقم : (٧٣٤) .
[5] صحيح سنن أبـــي داود رقم : (٨٦٣) .
[6] سنن البيهقي رقم : (٢٥٢٦) و (٢٥٢٧) .
[7] صحيح سنن الترمذي رقم : (٢٧٠) .
[8] صحيح سنن النسائي رقم : (٢٥٢٢) .
[9] سنن البيهقي رقم : (٢٤٧٥) وصححه الألبانـــي .

**رووده‌كـرد لـه قیبلـه[١] ، وه نێـوان هـه‌ردوو ڕانـی و هـه‌ردوو قاچی دووردەخستەوە ، هەروەها نێوان هەردوو ڕانی و سکی دووردەخستەوە ، وە هەردوو بـازووی لـە هـەردوو لاکەلـەکی دووردەخستەوە تاوەکو سپیایی هەردوو بنباڵی لە پشتەوەی دەردەکـەوت[٢] ، وە لـە سـوجدەکەیدا سـێ جـار دەیـوت :** (سُبْحَانَ رَبِّـــيَ الأَعْلَى)[٣] **، وە هەنـدێك جـاریش لـەوە زیـاتر دووبـارەی دەکـردەوە ، وە ئـەو زیکرانەشـی دەوت کـە لـە زیکرەکـانی رکوعـدا باسمـان کـردن ، وە دوعـای دەکـرد و دەپاڕایەوە و دەیـوت :** (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي كُلَّهُ : دِقَّهُ وَجِلَّهُ ، وَأَوَّلَهُ وَآخِرَهُ ، وَعَلَانِيَتَهُ وَسِرَّهُ)[٤] / **خوایە لـە هـەموو تاوانـەکانم خۆشبە : بچوك و گـەورەی ، ئـەوەڵ و ئـەخیری ، ئاشـکرا و نهێنیی) ، هەروەها دەیوت :** (اللَّهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ ، وَبِكَ آمَنْتُ ، وَلَكَ أَسْلَمْتُ ، سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ وَشَقَّ سَــــمْعَهُ وَبَصَرَهُ ، فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْــخَالِقِينَ)[٥] **، هەروەها دەیـوت :**

---

(١) صحيح البخاري رقم : (٧٩٤) .

(٢) صحيح البخاري رقم : (٣٨٣) وصحيح مسلم رقم : (١١٠٥) وسنن البيهقي رقم : (٢٥٣٤) .

(٣) صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٨٨٨) . (٤) صحيح مسلم رقم : (١٠٨٤) .

(٥) صحيح مسلم رقم : (١٨٠٩) .

(اللَّهُمَّ أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ ، وَبِــمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ ، لَا أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْـــتَ عَلَـــى نَفْسِكَ)[1] ، **وە پێغەمبەر** (عَلَيهِ الصَّلَاةِ وَالــسَّلَام) **فەرموویەتی :** ((أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الْعَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُوَ سَاجِدٌ فَأَكْثِرُوا الـــدُّعَاءَ))[2]

**واتە : كاتێك عەبد نزیكترە لە خوای پەروەردگاری كە لە سوجدەدایە بۆیە زۆر دوعابكەن و بپاڕێنەوە .**

**پاشان لە سوجدە سەری بەرز دەكردەوە لەگەڵ وتنی :** (اللَّهُ أَكْبَر)[3] **تاوەكو بە دانیشتنەوە ڕێك و ڕاست دەبوویەوە ، وە قاچی چەپی ڕادەخست و لەسەری دادەنیشت و قاچی ڕاستیشی جێگیر دەكرد لە زەوی و پەنجەكانی پێی ڕاستی ڕوودەكرد لە قیبلە[4] ، وە هەردوو لەپی لەسەر هەردوو ڕانی یان لەسەر هەردوو ئەژنۆی دادەنا و دەیوت :** (رَبِّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي وَاجْبُرْنِي وَارْفَعْنِي وَاهْـــدِنِي وَعَـــافِنِي وَارْزُقْنِـــي)[5] / **پەروەردگارە لێم خۆشبە و ڕەحمم پێبكە و كەموكوڕیەكانم پڕكەرەوە و بەرزم كەرەوە و ڕێنماییم بكە و بێوەیم بكە و**

---

(١) صحيح مسلم رقم : (١٠٩٠) . (٢) صحيح مسلم رقم : (١٠٨٣) .

(٣) صحيح البخاري رقم : (٧٧٠) . (٤) سنن البيهقي رقم : (٢٤٧٦) وصحيح سنن النسائي رقم : (١١٥٨) . (٥) صحيح سنن أبي داود رقم : (٨٥٠) وصحيح سنن الترمذي رقم : (٢٨٤) .

رزقوروزيم بده) ، وه هه‌ندێك جاريش ده‌يوت : (رَبِّ اغْفِرْ لِي ، رَبِّ اغْفِرْ لِي[١] / پـه‌روه‌ردگاره لـێم خۆشـبه ، پـه‌روه‌ردگاره لێم خۆشبه) ، وه دانيشتنی نێوان هه‌ردوو سوجده‌كه‌ی درێـژ ده‌كـرده‌وه تـاوه‌كو نزيـك ده‌بوويـه‌وه لـه سـوجده‌كه‌ی[٢] ، پاشان سوجده‌ی ده‌برده‌وه و ئه‌وه‌ی تێدا ئه‌نجامده‌دا كه لـه سوجده‌ی يه‌كه‌مدا ئه‌نجاميـده‌دا ، پاشـان هه‌ڵده‌سـايه‌وه بـۆ ركعاتی دووه‌م .

وه سه‌باره‌ت به دانيشتنی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) بۆ شايه‌تومان و ته‌حيات : ئه‌وا له‌پی ڕاستی له‌سه‌ر ڕانی يان ئـه‌ژنۆی ڕاسـتی داده‌نـا و بـه پـه‌نجـه‌ی شـايه‌تومانی ئامـاژه‌ی ده‌كـرد رووه‌و قيبله[٣] ، وه ده‌يجوڵاند و دوعای پێ‌ده‌كرد و ده‌پاڕايه‌وه[٤] ، وه چاويـشی تێـده‌بڕی و سـه‌يری ده‌كـرد[٥] ، وه بـاقی تـری په‌نجه‌كانی ده‌ستی ڕاستی هه‌ر هـه‌موويانی ده‌نوقانـد[٣] يـان ئه‌ڵقه‌يه‌كی ده‌كرد به په‌نجه گه‌وره و په‌نجه ناوه‌ڕاستينه‌ی[٦] ،

---

(١) صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٨٩٧) .
(٢) صحيح البخاري رقم : (٧٨٦) وصحيح مسلم رقم : (١٠٥٧) .
(٣) صحيح مسلم رقم : (١٣١١) .  (٤) صحيح سنن النسائي رقم : (٨٨٩) .
(٥) صحيح سنن النسائي رقم : (١١٦٠) .  (٦) صحيح سنن النسائي رقم : (١٢٦٨) .

وە لەپی چەپیشی لەسەر ڕانی یان ئـەژنۆی چـەپـی دادەنـا و ڕایدەخست لەسەری[1] .

وە بە چەند شێوازێکی هەمەجۆر شـایەتومان و تـەحیاتی دەوت ، لەوانـە : (التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ ، الــسَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِـــيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْـــدُهُ وَرَسُـــــولُهُ)[2] ، پاشـان صـەڵاواتی‌دەدا لەسـەر خـۆی بـەو شێوازانەی کـە هـاتوون لەوانـە : (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْـــتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)[3] .

وە پێغەمبـەر (عَلَيهِ الصَّلَاةِ وَالسَّلَام) کاتێـك کـە هەڵدەسـایەوە بۆ ركعاتی سـێیەم دەیـوت (اللَّهُ أَكْبَر) و هـەردوو دەستیـشی بـــەرز دەكـــردەوە[4] ، وە كـــاتێكیش كـــە دادەنیـــشت بـــۆ شـــایەتومان و تـــەحیاتی كۆتـــایی هـــەمان ئـــەو كارانـــەی

---

[1] صحيح مسلم رقم : (١٣٠٩) و (١٣١١) .

[2] صحيح البخاري رقم : (٧٩٧) .

[3] صحيح البخاري رقم : (٣١٩٠) .

[4] صحيح البخاري رقم : (٧٠٦) و (٧٥٦) .

ئەنجامــدەدا كــە لــە شــايەتومان و تــەحياتى يەكەمــدا ئەنجاميانيدەدا تەنها ئەوە نەبێت كە بە شێوازى (تـەوەڕوك) دادەنيشت و پێى ڕاستى جێگير دەكرد لـە زەوى[١] و پـێى چەپيــشى دەخــستە ژێــر ڕان و قاچــى ڕاســتيەوە[٢] ، وە دەيفـەرموو : ((إِذَا فَرَغَ أَحَدُكُمْ مِنْ اَلتَّشَهُّدِ الآخِرِ فَلْيَسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنْ أَرْبَعٍ يَقُولُ : اللَّهُمَّ إِنِّـــي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ ، وَمِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ[٣] ، ثُمَّ يَدْعُو لِنَفْسِهِ بِـــمَا بَدَا لَـــهُ[٤])) واتـە : ئەگـەر يەكێك لە ئێوە لـە شـايەتومان و تـەحياتى كۆتـايى بوويـەوە ئەوا با پەنا بگرێت بە خوا لە چوار شـت و بلێـت : (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ ، وَمِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ / خوايـە مـن پـەنات پێدەگـرم لە سزاى دۆزەخ ، وە پەناشـت پێدەگـرم لە سـزاى ناو گۆڕ ، وە پەناشـت پێـدەگرم لـە فيتنـە و تاقيكردنـەوەى ژيــان و مــردن، وە پەناشــت پێــدەگرم لـــە فيتنـــە و

[١] صحيح البخاري رقم : (٧٩٤) .
[٢] صحيح مسلم رقم : (١٣٠٧) .
[٣] صحيح مسلم رقم : (١٣٢٦) .
[٤] صحيح سنن النسائي رقم : (١٣١٠) .

تاقیكردنەوەی دەججالی چاو سڕاوە) ، پاشان دوعا بۆ خۆی دەكات و دەپاڕێتەوە بەوەی كە بۆی دەردەكەوێت باشە بۆی .

وە (ئەبو بەكر)یشی (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) فێركردووە كە بڵێت : (اللَّهُــمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا ، وَلَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ ، فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ وَارْحَمْنِــي ، إِنَّك أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ)[١] .

واتە : خوایە من زوڵم و ستەمێكی زۆرم لە خۆم كردووە ، وە هیچ كەسێكیش لە تاوانەكان خۆشنابێت جگە لە تۆ نەبێت ، بۆیە لێم خۆشببە لێخۆشبوونێك لە لایەن خۆتەوە و رەحمم پێبكە ، بەڕاستی تۆ لێخۆشبوو و بە بەزەییت .

وە ئامۆژگاری (مُعَــاذ)یشی (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) كردووە كە لە دوای هەموو نوێژێكەوە بڵێت : (اللَّهُمَّ أَعِنِّــي عَلَى ذِكْرِكَ وَشُــكْرِكَ وَحُــسْنِ عِبَادَتِــكَ)[٢] واتە : خوایە یارمەتیم بدە لەسەر زیكركردن و شوكركردن و چاكێتی پەرستنت .

وە كۆتا شت كە پێغەمبەر (عَلَيهِ الصَّلَاةِ وَالــسَّلَام) لە نێوان تەحیات و سەلامدانەوەدا وتبێتی ئەمەیە : (اللَّهُمَّ اغفِرْ لِي مَا

---

(١) صحيح البخاري رقم : (٧٩٩) .
(٢) صحيح سنن أبــي داود رقم : (١٥٢٤) .

قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ وَمَا أَسْرَفْتُ ، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي ، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ ، لَـا إِلَـهَ إِلَّـا أَنْتَ)[١] .

**واتە : خوایە لێم خۆشببە لەوەی کە پێشم خستووە و لەوەش کە دوام خستووە ، وە لەوەش کە شاردوومەتەوە و لەوەش کە ئاشکرام کردووە ، وە لەوەش کە ڕۆچووم تێیدا و سنوورم تێدا بەزاندووە ، وە لەوەش کە تۆ زاناتری پێی لە من ، خوایە تۆ پێشخەر و تۆش دواخەریت ، هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها تۆ نەبێت .**

**پاشان پێغەمبەر** (عَلَيهِ الصَّلَاةِ وَالسَّلَام) **بەلای ڕاستیدا سەلامی دەدایەوە و دەیوت :** (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّه) **و لایدەکردەوە تاوەکو سپیایی گۆنای ڕاستی دەبینرا ، وە بەلای چەپیشیدا و دەیوت :** (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّه) **و لایدەکردەوە تاوەکو سپیایی گۆنای چەپی دەبینرا**[٢] .



---

[١] صحيح مسلم رقم : (١٨٠٩) .

[٢] صحيح مسلم رقم : (١٣١٥) وصحيح سنن أبـي داود رقم : (٩٩٨) .

## كاروكردار و ڕەفتاری پێغەمبەر (ﷺ) لە زیكرەكانی دوای نوێژ :
## (هَدِيهُ ﷺ فِي الأَذكَارِ بَعْدَ الصَّلَاة)

وە كاتێك كە پێغەمبەر (ﷺ) سەلامی دەدایەوە لە نوێژەكەی سێ جار دەیوت : (أَسْتَغْفِرُ اللَّه) پاشان دەیوت : (اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلَامُ وَمِنْكَ السَّلَامُ ، تَبَارَكْتَ يَا ذَا الْجَلَالِ وَالْإِكْرَام)[١] ، پاشان دەیوت : (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ، اللَّهُمَّ لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ ، وَلَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ ، وَلَا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ)[٢] ، (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ، لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّه ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَلَا نَعْبُدُ إِلَّا إِيَّاهُ ، لَهُ النِّعْمَةُ وَلَهُ الْفَضْلُ وَلَهُ الثَّنَاءُ الْحَسَنُ ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُون)[٣] ، وە دەیوت : (رَبِّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ عِبَادَكَ)[٤].

وە پێغەمبەر (ﷺ) هانی ئوممەتەكەشیداوە بۆ ئەوەی كە لە پاش هەموو نوێژێك سی وسێ جار بڵێن : (سُبْحَانَ اللَّه) و

---

[١] صحيح مسلم رقم : (١٣٣٣) .
[٢] صحيح البخاري رقم : (٨٠٨) .
[٣] صحيح مسلم رقم : (١٣٤٤) .
[٤] صحيح مسلم رقم : (١٦٤٠) .

**سیوسێ جاریش بڵێن : (**الْـــحَمْدُ لِلَّه**) و سیوسێ جاریش بڵێن : (**اللَّهُ أَكْبَر**) و له تهواوی سهدهکهشدا بڵێن : (**لَا إِلَهَ إِلَّـــا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْـــحَمْدُ ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ**) وه هەواڵیشیداوه كه پاداشتی ئەوه بریتییه لـه : (**غُفِرَتْ خَطَايَاهُ وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْـــرِ**)[1] **واتـه : خـوا لـه تاوانهکانی خۆشدهبێت ئهگەر چی وهكو كەفـی دەریایش بێت .**

**وه پێغەمبەر (ﷺ) دەنگی بەرزدەكردەوه بە خوێندنـەوەی زیكرەكان**[2] **، وه به دەستی تەسبیحاتی هەژمار دەكـرد**[3] **، وه هەواڵیشیداوه بەوەی كه : ((**مَنْ قَرَأَ آيَةَ اَلْكُرْسِيِّ دُبُرَ كُـــلِّ صَلَاةٍ مَكْتُوبَةٍ لَمْ يَـــمْنَعْهُ مِنْ دُخُولِ الْـــجَنَّةِ إِلَّا أَنْ يَـــمُوْتَ**))**[4] **واتـه : هەركەسێك لـه پـاش هـەموو نوێـژێكی فـەرز (**آيَـــةُ اَلْكُرْسِي**) بخوێنێت ئەوا هیچ شتێك نابێته بەربەست بـۆی لـه چوونه ناو بەهەشت تەنها ئەوه نەبێت كه بمرێت .**

**وه فەرمانیشی كردووه بـه خوێندنـەوەی سـورەتەكانی :** ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ﴾ ، ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴾ ، ﴿قُلۡ هُوَ

---

[1] صحيح مسلم رقم : (١٣٥١) .
(٢) صحيح البخاري رقم : (٨٠٥) .
[3] صحيح سنن الترمذي رقم : (٣٤٨٦) .
(٤) صحيح الجامع الصغير رقم : (١١٤١٠) .

ٱللَّهُ أَحَــدٌ ﴾[١] .

**وە پێغەمبــەر** (ﷺ) **كاتێــك كــە نوێــژی بــەیانی دەكــرد و سەلامی دەدایــەوە دەیــوت :** (اللَّهُمَّ إِنِّــــي أَسْأَلُكَ عِلْمًا نَافِعًا ، وَرِزْقًا طَيِّبًا ، وَعَمَلًا مُتَقَبَّلًا)[٢] **واتــە : خوایــە مــن داوای زانــستی بەســـوود و ڕزق وڕۆزی حـــەلاڵ و كـــردەوەی قـــەبوڵكراوت لــێ دەكەم .**

**وە پێغەمبەر** (عَلَيهِ الصَّلَاةِ وَالسَّلَام) **فەرموویــەتی :** ((مَنْ قَـــالَ قَبْلَ أَنْ يَنْصَرِفَ وَيَثْنِـــيَ رِجْلَهُ مِنْ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ وَالصُّبْحِ : "**لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ ، بِيَدِهِ الْخَيْرُ ، يُحْيِي وَيُمِيتُ ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ**" عَشْرَ مَرَّاتٍ كُتِبَ لَـــهُ بِكُلِّ وَاحِدَةٍ عَشْرُ حَسَنَاتٍ ، وَمُـــحِيَتْ عَنْهُ عَشْرُ سَيِّئَاتٍ ، وَرُفِعَ لَهُ عَشْرُ دَرَجَاتٍ ، وَكَانَتْ حِرْزًا مِنْ كُلِّ مَكْرُوهٍ ، وَحِرْزًا مِنْ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ، وَلَمْ يَـــحِلَّ لِذَنْبٍ يُدْرِكُهُ إِلَّا الشِّرْكَ ، وَكَانَ مِنْ أَفْـــضَلِ النَّاسِ عَمَلًا إِلَّا رَجُلًا يَفْضُلُهُ يَقُولُ أَفْضَلَ مِـــمَّا قَالَ))[٣] .

**واتــە : هەركەسـێك پـێش ئـەوەی كـە لـە شـوێنی خـۆی هەڵبـسێت و پـێش ئـەوەی قاچـی پێـچبداتەوە لـە شـێوەی**

---

[١] صحيح سنن أبـــي دواد رقم : (١٥٢٥) .
[٢] صحيح سنن ماجه رقم : (٩٢٥) .
[٣] صحيح الترغيب والترهيب رقم : (٤٧٧) .

دانیشتن بۆ تەحیات خوێندن لە دوای هەردوو نوێژی مەغریب و بەیانی (١٠) جار بڵێت : (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ ، بِيَدِهِ الْخَيْرُ ، يُحْيِي وَيُمِيتُ ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ / هیچ پەرستراوێك نىیە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خوا تەنهایە و بێ شەریکە ، موڵك و ستایش تەنها هی ئەوە ، خێر و خۆشی لە دەستی ئەودایە ، ژیان دەبەخشێت و دەشمرێنێت ، وە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە) ئەوا خوای گەورە بە هەر دانەیەکیان دە چاکەی بۆ دەنووسێت و دە خراپەشی دەسڕێتەوە و دە پلەیش بەرزی دەکاتەوە و دەبێتە پارێزەریش بۆی لە هەموو خراپەیەك ، وە پارێزەریشە بۆی لە شەیتانی دەرکراو لە رەحمەتی خوا ، وە لەگەڵ ئەمەدا هیچ تاوانێکیش نىیە بتوانێت لەناوی بەرێت و بیفەوتێنێت تەنها شیرك نەبێت ، وە کردەوەی لە هەموو خەڵك باشترە تەنها پیاوێك لە ئەو باشترە کە لەوەی ئەو باشتر بڵێت .

وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پارێزگاری دەکرد لە پێنج نوێژە فەرزەکان و هەواڵیشیداوە خوای گەورە لە ڕۆژ و

شەوێكدا فەرز و پێویستی كردوون لەسەر عەبدەكانی[١] ، وە هەواڵیشیداوە خوای گەورە پێنج نوێژە فەرزەكان دەكاتە هۆكاری سڕینەوەی هەڵە و تاوانەكان[٢] ، وە هەركەسێكیش ئەنجامیان بدات و جوانكار و چاكەكار بێت لە دەستنوێژ بۆ گرتن و خشوع و ركوعیان ئەوا دەبنە مایەی سڕینەوەی تاوانەكانی پێش خۆیان ئەگەر تاوانی گەورەی نەكردبێت[٣] ، وە هەواڵیشیداوە هەركەسێك واز لە نوێژ بێنێت ئەوا كوفری كردووە[٤].

وە هانیشیداوە بۆ نوێژی جەماعەت لە مزگەوت و فەرموویەتی : ((صَلَاةُ الرَّجُلِ فِي الْجَمَاعَةِ تُضَعَّفُ عَلَى صَلَاتِهِ فِي بَيْتِهِ وَفِي سُوقِهِ خَمْسًا وَعِشْرِينَ ضِعْفًا ، وَذَلِكَ أَنَّهُ إِذَا تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الْمَسْجِدِ لَا يُخْرِجُهُ إِلَّا الصَّلَاةُ ، لَمْ يَخْطُ خَطْوَةً إِلَّا رُفِعَتْ لَهُ بِهَا دَرَجَةٌ ، وَحُطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةٌ ، فَإِذَا صَلَّى لَمْ تَزَلْ الْمَلَائِكَةُ تُصَلِّي عَلَيْهِ مَا دَامَ فِي مُصَلَّاهُ : اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَيْهِ ، [اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ] ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ ، وَلَا يَزَالُ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاةٍ مَا انْتَظَرَ الصَّلَاةَ))[٥]

---

[١] صحيح سنن أبـي دواد رقم : (١٤٢٢) .
[٢] صحيح البخاري : (٥٠٥) .
[٣] صحيح مسلم رقم : (٥٤٢) .
[٤] صحيح سنن الترمذي رقم : (٢٦٢١) .
[٥] صحيح البخاري رقم : (٦٢٠) وصحيح مسلم رقم : (١٤٧٦) .

واته : نوێژی پیاوێك بـه جەماعـەت بیـست و پێـنج ئەوەنـدە دەبێتـــەوە لەبەرامبـــەر نوێـــژكردنی لـــە ماڵەكەیـــدا و لـــە بازاڕەكەیدا ، ئـەوەیش بـەوە دەبێـت كـە ئەگـەر دەسـتنوێژ بگرێت و بە جوانی و ڕێكوپێكی دەسـتنوێژ بگرێـت و پاشـان دەربچێت بۆ مزگەوت و هیچ ئیش و كارێك دەرینـەكات تـەنها نوێژكردن نەبێت ، ئەوا هیچ هەنگاوێك نانێت ئیللا بە هۆیەوە پلەیـەك بـەرز دەبێتـەوە و بـە هۆیـشیەوە هەڵـە و تـاوانێكی دەسڕێتەوە ، وە كە نوێژی كرد بەردەوام فریشتەكان دوعای بۆ دەكەن ئەوەندەی كە ئەو لە شوێنی نوێژكەیدا بمێنێتـەوە و دەڵێن : خوایە ستایشی بكە و بە چاكە باسی بكە و خوایە لــێی خۆشـبە و رەحمـی پێبكـە ، وە بـەردەوام یـەكێك لـە ئێوە لە نوێژدایە ئەوەندەی كە چاوەڕێی نوێژ بكات .

وە بە دڵیشیدا هاتووە ماڵی ئـەو كەسانە بـسوتێنێت كـە ئامادەی نوێژی جەماعەت نابن لە مزگەوت[١] .

وە پێغەمبـەر (عَلَيهِ الصَّلَاة وَالسَّلَام) فەرموویـەتی : ((مَنْ صَـــلَّى الْعِشَاءَ فِي جَمَاعَةٍ فَكَأَنَّـــمَا قَامَ نِصْفَ اللَّيْلِ ، وَمَنْ صَلَّى الصُّبْحَ فِي

[١] صحيح البخاري رقم : (٢٢٨٨) وصحيح مسلم رقم : (١٤٨٨) .

جَمَاعَةٍ فَكَأَنَّـــمَا صَلَّى اللَّيْلَ كُلَّهُ))[1] **واتە : هەرکەسێك نوێـژی عیـشا بکـات بـە جەماعـەت وەکـو ئـەوە وایـە نیـوەی شـەو هەســتابێت شــەونوێژی کردبێــت ، وە هەرکەســێك نوێــژی بەیانیش بکـات بـە جەماعـەت وەکـو ئـەوە وایـە هـەموو شـەو هەستابێت شەونوێژی کردبێت .**

**وە هەواڵیشیداوە هەرکەسێك نوێژی بەیانی و عەسر بکات ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە[2] .**

**وە پێغەمبەر** (عَلَيهِ الصَّلَاةِ وَالسَّلَام) **پارێزگاری دەکرد لە نوێژە سوننەتە جێگیر و بەردەوامەکان** (السُّنَنُ الرَّوَاتِب) ، قَالَ ابْـــنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُـــما) : ((حَفظْتُ مِنْ النَّبِـــيِّ (ﷺ) عَشْرَ رَكَعَـــاتٍ : رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الظُّهْرِ ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ فِي بَيْتِهِ ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعِشَاءِ فِي بَيْتِهِ ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ الصُّبْحِ))[3] **واتە : دە رکعاتم لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) لەبـەرکردووە : دوو رکعات لە پێش نیوەڕۆ ، وە دوو رکعـاتیش لـە دوایـەوە ، وە دوو رکعــاتیش لــە دوای مــەغریب لــە ماڵەکەیــدا ، وە دوو رکعاتیش لە دوای عیشا لە ماڵەکــەیدا ، وە دوو رکعاتیش لە**

---

[1] صحيح مسلم رقم : (١٤٨٩) .
(٢) صحيح البخاري : (٤٧٧) .
[3] صحيح البخاري : (١١٢٦) .

پێش نوێژی بەیانی .

وە هەندێك جاریش لە پێش نیوەڕۆ چوار ركعاتی دەكرد لە ماڵەكەیدا[١] .

وە لە سوننەتی مەغریبدا هـەردوو سـورەتی (الْكَافِرُون) و (الْإِخْلَاص)ی دەخوێند[٢] ، هەروەها هەندێك جار لە سوننەتی بەیانیـشدا هــەمان ئــەو دوو ســورەتەی دەخوێنــد[٣] ، وە هەندێك جاریش لە ركعاتی یەكەمدا ئەم ئایەتـەی دەخوێنـد : ﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ١٣٦ ﴾ [البقــــرة] ، وە لـە ركعـاتی دووەمیـشدا ئـەم ئایەتـەی دەخوێنـد : ﴿ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٖ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ أَلَّا نَعۡبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشۡرِكَ بِهِۦ شَيۡـٔٗا وَلَا يَتَّخِذَ بَعۡضُنَا بَعۡضًا أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُولُواْ ٱشۡهَدُواْ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ ٦٤ ﴾[٤] [آل عمران] .

---

[١] صحيح البخاري : (١١٢٧) .

[٢] صحيح سنن الترمذي رقم : (٤٣١) .

[٣] صحيح مسلم رقم : (١٦٨٧) .

[٤] صحيح مسلم رقم : (١٦٨٨) .

وه پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی سەرلەبەیانی (نوێژی زوحا)شی دەکرد[1] ، وه وەسیێتیشی پێ کردووه بە (أَبُو هُرَيْرَةَ رضي الله عنه)[2] ، وه هەواڵیشیداوه ئەم نوێژه جێی ئەو هەموو خێر و صەدەقەیە دەگرێتەوە کە پێویستە لەسەر جومگەکانی لەش ڕۆژانە ئەنجامی بدەن[3] واتە بەرامبەر بە (٣٦٠) صەدەقە کردنە .

وه پێغەمبەر (عَلَيهِ الصَّلَاةِ وَالسَّلَام) پێش عەسر چوار رکعاتی دەکرد و نێوبەینی دەخستە نێوان هەر دوو رکعاتێکەوە[4] ، وه پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((رَحِمَ اللَّهُ امْرَأً صَلَّى قَبْلَ الْعَصْرِ أَرْبَعًا))[5] واتە : خوا ڕەحم بەو کەسە بکات کە لە پێش عەسر چوار رکعات دەکات .



---

(١) صحيح مسلم : (١٦٦٢) وصحيح سنن الترمذي رقم : (٤٧٤) .

(٢) صحيح البخاري : (١١٢٤) .

(٣) صحيح مسلم رقم : (١٦٦٨) .

(٤) صحيح سنن الترمذي رقم : (٤٢٩) .

(٥) صحيح سنن الترمذي رقم : (٤٣٠) .

# كردارو ڕەفتاری پێغەمبەر (ﷺ) لە زیکرەکانی بەیانیان و ئێوارانددا

# (هَدِيهُ عَلَيهِ الصَّلَاةِ وَالسَّلَام فِي أَذْكَارِ الصَّبَاحِ وَالْمَسَاء)

**پێغەمبەر** (عَلَيهِ الصَّلَاةِ وَالسَّلَام) **كە نوێژی بەیانی دەكرد لە شوێنی نوێژكردنەكەی دادەنیشت زیكری خوای دەكرد تاوەكو خۆر هەڵدەهات**[1] ، **وە پێغەمبەر (ﷺ) كە بەیانی بەسەردا دەهات دەیوت :** (اللَّهُمَّ بِكَ أَصْبَحْنَا وَبِكَ أَمْسَيْنَا ، وَبِكَ نَحْيَا وَبِكَ نَمُوتُ ، وَإِلَيْكَ النُّشُورُ) **وە كە ئێوارەی بەسەردا دەهات دەیوت :** (اللَّهُمَّ بِكَ أَمْسَيْنَا وَبِكَ أَصْبَحْنَا ، وَبِكَ نَحْيَا وَبِكَ نَمُوتُ ، وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ)[2] .

**هەروەها دەیوت :** (أَصْبَحْنَا وَأَصْبَحَ* الْمُلْكُ لِلَّه ، وَالْحَمْدُ لِلَّه ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ، رَبِّ أَسْأَلُكَ خَيْرَ مَا فِي هَذَا

---

[1] صحيح مسلم : (١٢٢٣) و (١٥٢٤) .

(٢) سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٦٢) .

* **بەیانیان ئەوە دەڵێت ، بەڵام ئێواران لە بری** ((**أَصْبَحْنَا وَأَصْبَحَ** الْمُلْكُ لِلَّه ... رَبِّ أَسْأَلُكَ خَيْرَ مَا فِي **هَذَا الْيَوْمِ** وَخَيْرَ مَا **بَعْدَهُ** ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا فِي **هَذَا الْيَوْمِ** وَشَرِّ مَا **بَعْدَهُ** ...)) **دەڵێت :** ((**أَمْسَيْنَا وَأَمْسَى** الْمُلْكُ لِلَّه ... رَبِّ أَسْأَلُكَ خَيْرَ مَا فِي **هَذه اللَّيْلَة** وَخَيْرَ مَا **بَعْدَهَا** ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا فِي **هَذه اللَّيْلَة** وَشَرِّ مَا **بَعْدَهَا** ...)) .

الْيَوْمِ وَخَيْرَ مَا بَعْدَهُ ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا فِي هَذَا الْيَوْمِ وَشَرِّ مَا بَعْدَهُ ، رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَسُوءِ الْكِبَرِ ، رَبِّ أَعُوذُ بِـــكَ مِنْ عَذَابٍ فِي النَّـــارِ وَعَذَابٍ فِي الْقَبْرِ)[1].

**هەروەها دەیوت :** (أَصْبَحْنَا عَلَى فِطْرَةِ الإِسْـــلَامِ ، وَعَلَـــى كَلِمَةِ الإِخْلَاصِ ، وَعَلَى دِينِ نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ (ﷺ) وَعَلَى مِلَّةِ أَبِيْنَـــا إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا مُسْلِمًا ، وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ) **وە كە ئێوارەی بەسەردا دەهات دەیوت :** (أَمْسَيْنَا عَلَى فِطْرَةِ الإِسْلَامِ ...)[2].

**وە پێغەمبـــەر (ﷺ) وازی لـــەم دوعایانـــە نـــەدەهێنا کـــە بەیانی بەسەردا دەهات و ئێوارەی بەسـەردا دەهـات :** (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْـــأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي دِينِي وَدُنْيَايَ وَأَهْلِي وَمَالِي ، اللَّهُمَّ اسْتُرْ عَوْرَاتِي ، وَآمِنْ رَوْعَاتِـــي ، اللَّهُمَّ احْفَظْنِـــي مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ وَمِنْ خَلْفِي وَعَنْ يَـــمِينِـــي وَعَنْ شِـــمَالِي وَمِنْ فَوْقِي ، وَأَعُوذُ بِعَظَمَتِكَ أَنْ أُغْتَالَ مِنْ تَـــحْتِـــي)[3].

**وە كـە بـەیانی بەسـەردا دەهـات و ئێـوارەی بەسـەردا دەهات سێ جار دوعای دەكرد بەم وتەیـەی :** (اللَّهُمَّ عَافِنِـــي

---

(1) صحيح مسلم : (٦٨٤٦) .   (٢) مسند الإمام أحمد رقم : (١٥٣٦٣) .

(3) صحيح سنن أبـــي داود رقم : (٥٠٧٦) .

فِي بَدَنِي ، اللَّهُمَّ عَافِنِي فِي سَمْعِي ، اللَّهُمَّ عَافِنِي فِـــي بَصَرِي ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْكُفْرِ وَالْفَقْرِ ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ)[1] .

**وە هەواڵیشیداوە گەورە و سەروەری جۆر و شێوازەکانی داوای لێخۆشبوون ئەمەیـە :** (اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ ، خَلَقْتَنِـــي وَأَنَا عَبْدُكَ ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْـــتَطَعْتُ ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ ، وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي ، فَاغْفِرْ لِي ، فَإِنَّهُ لَـــا يَغْفِـــرُ الـــذُّنُوبَ إِلَّـــا أَنْـــتَ) **وە هەرکەسێك بەدڵنیاییەوە ئەمە بڵێت و لـەو ڕۆژەیـدا یـان لـەو شەوەیدا بمرێت ئەوا ئەو کەسە لە خەڵکی بەهەشتە**[2] .

**وە هەواڵیشیداوە بەوەی کـە خوێندنـەوەی :** ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ﴾ **و هەردوو پەناپێگیراوەکان** [﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ﴾ **و** ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾] **سـێ جـار لـە بـەیانیان و ئێوارانـدا بەسە بۆ هەموو شتێك**[3] .

---

(١) صحيح سنن أبـــي داود رقم : (٥٠٩٢) .

(٢) صحيح البخاري رقم : (٥٩٤٧) .

(٣) صحيح سنن الترمذي رقم : (٣٥٧٥) .

**وه هەواڵێشیداوه هەركەسێك له بەیانیان و ئێواراندا سێ جار بڵێت :** (بِسْمِ اللَّهِ الَّذِي لَا يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ) **ئەوا هیچ شتێك زیانی پێناگەیەنێت**[1].

**وه (ئەبو بەكر)یشی** (رضي الله عنه) **فێركردووه كه له بەیانیان و ئێواراندا بڵێت :** (اللَّهُمَّ عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ ، فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ ، رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي وَشَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ ، وَأَنْ أَقْتَرِفَ عَلَى نَفْسِي سُوءًا أَوْ أَجُرَّهُ إِلَى مُسْلِمٍ)[2].

**وه ئامۆژگاری** (فَاطِمَة)**ی كچیشی** (رضي الله عنها) **كردووه كه له بەیانیان و ئێواراندا بڵێت :** (يَا حَيُّ يَا قَيُّومُ بِرَحْمَتِكَ أَسْتَغِيثُ ، أَصْلِحْ لِي شَأْنِي كُلَّهُ ، وَلَا تَكِلْنِي إِلَى نَفْسِي طَرْفَةَ عَيْنٍ)[3].

**وه پێغەمبەر** (ﷺ) **فەرموویەتی :** ((مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ وَحِينَ يُمْسِي : **سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ** مِائَةَ مَرَّةٍ لَمْ يَأْتِ أَحَدٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ إِلَّا أَحَدٌ قَالَ مِثْلَ مَا قَالَ أَوْ زَادَ عَلَيْهِ))[4]

---

[1] صحيح سنن الترمذي رقم : (٣٣٨٨) .

[2] صحيح سنن الترمذي رقم : (٣٣٩٢) .

[3] سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٢٧) .

[4] صحيح مسلم : (٦٧٨٤) .

**واتە : هەركەسێك كاتێك كە بەیانی بەسـەردادێت و ئێـوارەی بەسەردادێت سەد جـار بڵێـت :** (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِـــحَمْدِهِ) **ئـەوا هیچ كەسێك لە ڕۆژی قیامەتدا باشتر لەوەی ئەوی نـەكردووە تەنها مەگەر كەسێك نەبێت كە هاوێنـەی ئـەوی وتبێـت یـان لەوە زیاتر ، وە هەواڵیشیداوە بەوەی كە ئـەم كـارە دەبێتـە هۆكـاری سـڕینەوەی هەڵـە و تاوانـەكانی ئەگـەر چـی وەكـو كەفـی دەریایش بێت**[1] .

**هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویـەتی :** ((مَنْ قَالَ : "**لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ**" فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ ، كَانَتْ لَهُ عَدْلَ عَشْرِ رِقَابٍ ، وَكُتِبَتْ لَهُ مِائَةُ حَسَنَةٍ ، وَمُـــحِيَتْ عَنْهُ مِائَةُ سَيِّئَةٍ ، وَكَانَتْ لَـــهُ حِرْزًا مِنْ الشَّيْطَانِ يَوْمَهُ ذَلِكَ حَتَّى يُـــمْسِيَ ، وَلَمْ يَـــأْتِ أَحَـــدٌ بِأَفْضَلَ مِـــمَّا جَاءَ بِهِ إِلَّا أَحَدٌ عَمِلَ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ))[2] .

**واتە : هەركەسێك لە ڕۆژێكدا سەد جار بڵێت :** (لَا إِلَهَ إِلَّـــا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْـــحَمْدُ ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) **ئەوا بۆی وەكو ئەوە وایە كـە (١٠) كۆیلـەی ئـازاد**

---

[1] صحيح البخاري رقم : (٦٠٤٢) .

(٢) صحيح البخاري رقم : (٣١١٩) .

كردبێت ، وە (١٠٠) حەسـەنە و چاكەشـی بـۆ دەنووسـرێت ، وە (١٠٠) خراپـەشـی لەسـەر دەسـڕێتەوە ، وە بـۆی دەبێتـە پارێزەر لـە شـەیتان ئـەو ڕۆژەی تـاوەكو ئێـوارەی بەسـەردا دێـت ، وە هـیچ كەسـێكیش باشـتر لـەوەی ئـەوی نـەكردووە تەنها مەگەر كەسێك نەبێت كە زیاتر لەوەی كردبێت .

## ئەوەی كە تەنها لە بەیانیاندا دەوترێت

## (مَا يُقَالُ فِي الصَّبَاحِ فَقَطْ)

وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویـەتی : ((مَـــنْ قَـــالَ إِذَا أَصْبَحَ : رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا ، وَبِالإِسْلامِ دِيْنًا ، وَبِـــمُحَمَّدٍ نَبِيًّـــا ، فَأَنَا الزَّعِيمُ لآخُذَنَّ بِيَدِهِ حَتَّـــى أُدْخِلَهُ الْـــجَنَّةَ))[١] .

واتـە : هەركەسێك بەیانیان بڵێت : ڕازیم بـەوەی كـە خـوا (ﷲ) پـەروەردگارمە و ئیسلام ئاینمە و (مُـــــحَمَّد)یـش (ﷺ) پێغەمبەرە ، ئەوا من كەفیلی ئەوە دەكەم كـە دەسـتی بگـرم تاوەكو دەیخەمە بەهەشتەوە .

---

[١] سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٦٨٦) .

# ئەوەی کە تەنها لە ئێوارەندا دەوترێت

## (مَا يُقَالُ فِي الْمَسَاءِ فَقَطْ)

وە پێغەمبەری خـوا (ﷺ) هەواڵیـداوە هەرکەسـێك کاتێـك کە ئێوارەی بەسەردا دێت سێ جار بڵێت : (أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ / پەنادەگرم بە وتە تـەواوەکانی خـوا لە شەڕ و خراپـەی ئـەوەی کـە دروسـتی کـردووە) ئـەوا ئـەو شەوە ژەهری پێوەدان زیانی پێناگەیەنێت[1] .



[1] مسند الإمام أحمد رقم : (٧٨٩٨) .

## کردار و ڕەفتاری پێغەمبەر (ﷺ) لە خواردنی و خواردنەوەیدا

## (هَدِيهُ عَلَيهِ الصَّلَاةِ وَالسَّلَام فِي طَعَامِهِ وَشَرَابِهِ)

وە هەڵسوکەوت و ڕەفتاری پێغەمبەر (ﷺ) لە خواردنـدا : ئەوەی کە هەبووە ڕەدی نەکردووەتەوە و زۆریشی نەکردووە بۆ دابینکردنی خواردنی نەبوو ، وە هـیچ شـتێك لـە خواردنـە پاك و حەڵاڵەکانی لـێنزیك نەکراوەتـەوە ئـیللا خواردوویـەتی مەگەر لە ناخەوە ئارەزوویی نـەکردبێت ئـەو کاتـە وازی لـێ دەهێنـا بـە بـێ ئـەوەی حـەرامی بکـات ، وە هـەرگیز هـیچ خـواردنێکی عەیبـدار نـەکردووە ئەگـەر حـەزی لــێ کردبێـت خواردوویـەتی ئـەگینا وازی لــێی دەهێنـا[1] ، وە وەسـف و ستایشی ئەو خواردنەی دەکـرد کـە دەیخـوارد بـە مەبەسـتی دڵڕاگرتنی ئەو کەسەی کە خستبوویە پـێش دەسـتی[2] ، وە ئاکار و خووی پێغەمبەر (ﷺ) بریتی بوو لە خواردنی ئـەوەی کە لە بەردەستدا هەبوو ، ئەگەر هیچیشی دەست نەکەوتبایە ئەوا صەبری دەگرت تەنانەت لە برسـێتیدا بـەردی لـە سـکی

---

(١) صحيح البخاري رقم : (٥٠٩٣) .
(٢) صحيح مسلم رقم : (٥٣٢٣) .

دەپێچا[١] ، وە ڕۆژ تا ئێوارە بـەردەوام لـە برسـێتیدا خـۆیی بەم لاولادا پلدەدا و خورمای خراپیشی دەست نەدەکەوت کە سکی پێ پڕ بکات[٢] ، وە مـانگ لـە سـەرەتای دەرکەوتنیـدا بۆ جـاری یەکـەم و دووەم و سـێیەمیش دەبینـرا کەچـی لـە ماڵەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) ئاگر نەدەکرایەوە[٣] .

وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێك کە دەڕۆیشتە ناو ماڵەکەی خۆی دەیوت : "ئایا خواردنتان لەلا هەیە؟" جا ئەگەر پـێی بووترایە : نەخێر ، دەیوت : "من بەڕۆژووم"[٤] .

وە دووشەممان و پێنجشەممان بەڕۆژوو دەبوو[٥] ، وە لە هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو[٦] .

وە لـە سـەرەتای خواردنەکەیـدا نـاوی خـوای دەهێنـا و دەیوت : (بِـــسْمِ اللَّـــه) ، وە لـە کۆتاییەکەشـیدا سـوپاس و ستایشی خوای دەکرد و دەیوت : (الْحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ ، غَيْرَ مَكْفِيٍّ وَلَا مُوَدَّعٍ وَلَا مُسْتَغْنًـــى عَنْهُ رَبَّنَا)[٧] .

---

[١] مسند الإمام أحمد رقم : (١٤٢٢٠) .
[٢] صحيح مسلم رقم : (٧٣٨٥) .
[٣] صحيح البخاري رقم : (٦٠٩٤) .
[٤] صحيح سنن أبـــي داود : (٢٤٥٧) .
[٥] صحيح سنن النسائي : (٢٣٦٤) .
[٦] صحيح مسلم : (٢٧٣٦) .
[٧] صحيح البخاري رقم : (٥١٤٢) .

وه پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((مَنْ أَكَلَ طَعَامًا فَقَالَ : "الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنِي هَذَا وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّــي وَلَــا قُوَّةٍ" غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ))[1] واتە : هەركەسێك خواردنێكی خوارد و وتی : (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنِي هَذَا وَرَزَقَنِيهِ مِــنْ غَيْــرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلَا قُوَّةٍ / سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی كە ئەم خواردنەی پێدام و كردی بە نسیبم بە بێ هیچ جوڵە و توانایەك لە منەوە) ئەوا خوا لە تاوانەكانی پێشووی خۆش دەبێت .

وه پێغەمبەر (ﷺ) بە سێ پەنجە خواردنی دەخوارد و كە لــێدەبوویەوە دەیــانی لێــسایەوە پــێش ئــەوەی كــە بیانسڕێت[2] ، وە فەرمانیشی دەكرد كە بە دەستی ڕاست خواردن بخورێت و هەواڵیشیداوە كە شەیتان بە دەستی چەپی خواردن دەخوات و خواردنەوە دەخواتەوە[3] ، وە پێغەمبــەر (ﷺ) بــە پاڵدانــەوە و ڕاكــشان خــواردنی نەدەخوارد[4] ، وە زۆربەی خواردنەكانی لەسەر زەوی بۆ دادەنرا ، وە ڕێگریشی كردووە لە خواردنەوە بە پێوە[5] ،

---

[1] صحيح سنن الترمذي رقم : (٣٤٥٨) .
(٢) صحيح مسلم رقم : (٥٢٦٥) .
[3] صحيح مسلم رقم : (٥٢٣٣) .
(٤) صحيح البخاري : (٥٠٨٣) .
[5] صحيح مسلم رقم : (٥٢٤٦) .

وە زۆربەی خواردنەوەکانی بە دانیشتنەوە بووە[١] ، وە ئەگەر شتێکی بخواردایەتەوە ئەوا لە دەرەوەی دەفرەکە سێ جار هەناسەی دەدا و دەیفەرموو : (إِنَّـهُ أَرْوَى وَأَبْـرَأُ وَأَمْرَأُ)[٢] واتە : خواردنەوە بەم شێوازە تینووشکێنەرتر و بێزیانتر و ئاسانترە بۆ هەرسکردن .

وە پێغەمبەر (ﷺ) دوعای دەکرد بۆ ئەو کەسەی کە خواردن یان خواردنەوەی پێ بدایەت بەم وتەیەی : (اللَّهُـمَّ أَطْعِمْ مَنْ أَطْعَمَنِـي وَاسْقِ مَنْ سَقَانِـي[٣] / خوایە خواردن بدە بەو کەسەی کە خواردنی پێدام و خواردنەوەش بدە بەو کەسەی کە خواردنەوەی پێدام) ، وە دوعاشی دەکرد بۆ ئەو کەسەی کە میوانداریی دەکرد بەم وتەیەی : (اللَّهُـمَّ بَـارِكْ لَـهُمْ فِيمَا رَزَقْـتَهُمْ وَاغْفِـرْ لَـهُمْ وَارْحَمْهُـمْ[٤] / خوایە بەرەکەت و فەڕ بخەرە ناو ئەو ڕزق وڕۆزیەی کە بە نسیبت کردوون و لێیان خۆشبە و ڕەحمیان پێبکە) .



---

[١] صحيح مسلم رقم : (٥٢٥٠) .

[٢] صحيح مسلم رقم : (٥٢٥٥) .

[٣] صحيح مسلم : (٥٣٣٠) .

[٤] صحيح مسلم رقم : (٥٢٩٦) .

## كردار و ڕەفتاری پێغەمبەر (ﷺ) لە جلوبەرگی و ڕێكردنی و سواربوونی

## (هَدِيهُ عَلَيهِ الصَّلَاةِ وَالسَّلَام فِـي لِبَاسِهِ وَمَشِيهِ وَرُكُوبِهِ)

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) كاتێك كە جلی لەبەردەكرد دەیوت :** (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي كَسَانِي هَذَا الثَّوْبَ وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلَا قُوَّةٍ[1] / **سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی كە ئەم جلـەی لەبەركردم و كردی بە نسیبم بە بێ هیچ جوڵە و توانایـەك لـە منــەوە) ، وە ئەگــەر جلێكــی نــوێی لەبەربكردایــەت نــاوی دەهێنا بە ناوەكەی خـۆی (سـەروێن / عِمَامَة) یـان (كـراس / قَمِيص) یان (رِدَاء / لەخۆپێچ)** * **و ئـەنجا دەیـوت :** (اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ كَسَوْتَنِيهِ ، أَسْأَلُكَ خَيْرَهُ وَخَيْرَ مَا صُنِعَ لَهُ ، وَأَعُــوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهِ وَشَرِّ مَا صُنِعَ لَهُ[2] / **خوایە سوپاس و ستایش بۆ تۆ كە ئەم جلەت لەبەركردم ، داوای خێرەكەی و خێری ئەوەش**

---

[1] صحيح سنن أبـــي داود رقم : (٤٠٢٥) . (٢) صحيح سنن أبـــي داود رقم : (٤٠٢٢) .

* (الرِّدَاء / لەخۆپێچ) پۆشاكێكە نیوەی لای سەرەوەی لەشی مرۆڤــ دادەپۆشێت ، بۆ نموونە ئەو پارچە خاولییەی كە لە كاتی ئیحرامدا بۆ عومرە و حەج كـردن كـە دەدرێـت بەسـەر هـەردوو شـان و پـشت و سـنگ و سـكدا و لـە نـاووك بـەرەو سـەرەوەی لەشـی پێدادەپۆشرێت پێی دەوترێت (الرِّدَاء / لەخۆپێچ) .

**کە بۆی دروستکراوە لێت دەکەم ، وە پەناش دەگرم بە تۆ لە خراپەکەی و خراپەی ئەوەش کە بۆی دروستکراوە) .**

**وە خۆشەویسترین جل بەلای پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بریتی بووە لە (کراس / قَمِيص)[1] و (لەخۆپێچی هێڵدار / حِبَرة)[2] .**

**وە خۆشەویسترینی ڕەنگەکان بەلای پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بریتی بووە لە ڕەنگی سپی و فەرموویەتی : ((خَيْرُ ثِيَابِكُمْ الْبَيَاضُ ، فَالْبَسُوهَا وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ))[3] واتە : باشترینی جلەکانتان ڕەنگ سپیەکانە ، لەبەریان بکەن و مردووەکانتانیشی پێ کفنپۆش بکەن ، وە پێغەمبەر (ﷺ)**

---

[1] عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ : ((كَانَ أَحَبُّ الثِّيَابِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْقَمِيصَ)) صحيح سنن أبي داود رقم : (٤٠٢٧) وصحيح سنن الترمذي رقم : (١٧٦٢) .

**(قَمِيص / کراس) : پۆشاکێکی دووراوەیە دوو قۆڵپێداکەر و ملپێداکەرێکی هەیە کە شێوەی دەچێتە سەر دشداشە کە ئێستا بەوە ناسراوە .**

[2] عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) قَالَ : (( كَانَ أَحَبُّ الثِّيَابِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْحِبَرَةَ)) صحيح البخاري رقم : (٥٤٧٦) وصحيح مسلم رقم : (٥٤٠٨) .

**(حِبَرة / لەخۆپێچی هێڵدار) : جۆرە پۆشاکێکی لەخۆپێچراوی یەمەنییە لە لۆکە کە چەندین هێڵی سووری تێدایە .**

[3] صحيح سنن ماجه رقم : (٣٥٦٦) .

حەزی لە ڕەنگی سووری تەواو نەبووە و قەدەغە و ڕێگریشی لـێکردووە(١) .

وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەعنەت و نەفرەتی کـردووە لـە پیاوێك کە جل لەبەر بکـات لـە شـێوە و چـۆنێتی و شـێوازی جل لەبەرکردنی ئافرەت ، وە لەعنەت و نەفرەتیشی کردووە لـە ئافرەتێـك کـە جـل لەبـەر بکـات لـە شـێوە و چـۆنێتی و شێوازی جل لەبەرکردنی پیاو(٢) .

وە کاتێك کە پێغەمبـەر (ﷺ) دوو پۆشـاکی ڕەنگکـراو بـە ڕەنگی (عُصْفُر)ی* بینـی بەسـەر (عَبْدُ اللَّه بْــنُ عَمْــرِو بْــنِ الْعَاص)ـەوە فەرمووی : ((إِنَّ هَذِهِ مِــنْ ثِيَــابِ الْكُفَّــارِ فَلَـــا تَلْبَسْهَا))(٣) واتە : بەڕاستی ئەمـە لـە جـل و پۆشـاکی کـافر و بێباوەڕەکانە بۆیە لەبەری مەکە .

وە ڕێگریشی کردووە لە جل و پۆشاکی ناوبانگدەرکردن(٤) ، هــەروەها ڕێگریــشی کــردووە لــە پۆشــین و لەبــەر کردنــی

---

(١) صحيح مسلم رقم : (٥٤٠٤) . (٢) صحيح سنن أبــي داود رقم : (٤١٠٠) .

* (عُصْفُر) ڕەنگێکی سوور یان زەردی تایبەتـە لـە جـۆرە ڕووەکێك دەردەهێنرێت و پۆشاکی پێ ڕەنگ دەکرێت .

(٣) صحيح مسلم رقم : (٥٤٠١) . (٤) صحيح سنن أبــي داود رقم : (٤٠٣١) .

ئاورێشم و زێڕ بۆ پیاوان[١] ، وە ڕێگریشی كردووە لە پۆشاك شـــۆڕی و خـــشانی بـــە زەویـــدا بـــە مەبەســـتی فیـــز و خۆبەگـــەورەزانی[٢] و لـــە پۆشـــاك شـــۆڕیش بـــە ڕەهـــایی و فەرموویـــەتی : ((مَا أَسْفَلَ مِنْ الْكَعْبَيْنِ مِنْ الْإِزَارِ فَفِي النَّارِ))[٣] واتـــە : ئـــەوەی كـــە لـــە خـــوارووی هـــەردوو قولـــەپێوە شـــۆڕدەبێتەوە لـــە (ئیـــزار* / پۆشـــاكی لـــەپێكراو) ئـــەوە لـــە ئاگردایـــە ، وە ئیزارەكـــەی پێغەمبـــەر (ﷺ) تـــاوەكو نیـــوەی قاچی (لاقی) بووە[٤] .

وە پێغەمبـــەر (ﷺ) كاتێـــك كـــە (كـــراس / قَمِـــــیص)ی لەبەربكردایـــەت بـــەلای ڕاســـتی دەســـتی پـــێ‌دەكرد[٥] و فەرموویـــەتی : ((إِذَا لَبِسْتُمْ وَإِذَا تَوَضَّأْتُمْ فَابْدَأُوا بِأَيَـــامِنِكُمْ))[٦]

---

(١) صحيح مسلم رقم : (٥٣٦١) . (٢) صحيح البخاري رقم : (٣٤٦٥) .

(٣) صحيح البخاري رقم : (٥٤٥٠) .

* (الْإِزَار / ئیـزار) پۆشـاكێكە نیـوەی لای خـوارەوەی لەشـی مرۆڤـ دادەپۆشـێت ، بـۆ نموونە ئەو پارچە خاولییەی كە لە كاتی ئیحرامـدا بـۆ عـومرە و حـەج كـردن لـە نـاووك بەرەو خوارەوەی لەشی پێ‌دادەپۆشرێت پـێ‌ی دەوترێـت (الْـــإِزَار / ئیـزار) ، وە ئەمـە شەرواڵ و پانتۆڵ و هەموو جل و پۆشاكێكی تریش دەگرێتەوە كە لە پێ‌بكرێت یان لای خوارەوەی لەشی پێ‌دابپۆشرێت .

(٤) رواه الترمذي في "شمائل الـــنبـــي (ﷺ)" وصححه الألبانـــي في "مختصر الشمائل" رقم : (٩٧) .

(٥) صحيح سنن الترمذي رقم : (١٧٦٦) . (٦) صحيح سنن أبـــي داود رقم : (٤١٤٣) .

واته : ئەگەر جلتـان لەبـەر کـرد و دەسـتنوێژتان گـرت ئـەوا بـەلای ڕاسـتتان دەسـت پێبکـەن ، وە لـە کـاتی دامـاڵینی پۆشاکدا بەلای چەپ دەستی پێدەکرد ، وە بەهەمان شـێوە لە کاتی پێڵاو لەپێکردنیشیدا لای ڕاسـتی پـێش خـستووە و سەبارەت بە پـێی ڕاست فەرمووییـەتی : ((لِـتَكُنِ الْيُمْنَـــى أَوَّلَهُمَا تُنْعَلُ وَآخِرَهُمَا تُنْزَعُ))[1] واتـە : بـا یەکـەم جـار پـێی ڕاســـت پـــێڵاوی لـــەپێبکرێت و دوا جـــاریش پـــێڵاوی لەپێدابکەنرێت .

وە ڕێگریشی کردووە لە ڕێکردن بە یەك تاکە پێڵاوەوە[2] ، وە هەنـدێك جـاریش بـە پـێی پـەتی ڕێی کـردووە[3] ، وە پێغەمبـەر (عَلَيهِ الصَّلَاةِ وَالسَّلَام) کاتێـك کـە ڕێی دەکـرد خێـرا دەڕۆیشت وەکو ئەوەی کە لە بەرزاییەکەوە شۆڕببێتەوە[4] ، وە کە ڕێی دەکرد بەهێز و گورج وگۆڵ ڕێی دەکرد و خۆیی نەدەخشاند بـە زەویـدا بـەڵکو کـۆی لەشـی لـە زەوی بـەرز دەکردەوە .

---

[1] صحيح البخاري رقم : (٥٥١٧) . (٢) صحيح البخاري رقم : (٥٥١٨) .
[3] مسند الإمام أحمد رقم : (٢٣٨١٠) وانظر صحيح أبـي دواد : (٤ / ٢٠٦) وصحيح سنن أبـي دواد رقم : (٤١٦٢) . (٤) صحيح سنن الترمذي رقم : (٣٦٣٧) .

**وە پێغەمبەر** (عَلَيهِ الصَّلَاةِ وَالسَّلَام) **كاتێك كە پێی دەخستە سەر شوێنی سواربوون بۆ سواربوونی وڵاخەكەی دەیوت :** (بِسْمِ اللَّه) ، **وە كە سەردەكەوت بەسەر پشتیدا دەیوت :** (الْـحَمْدُ لِلَّه) **پاشان دەیوت :** ﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقۡرِنِينَ ، وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ﴾ **پاشان سێ جار دەیوت :** (الْـحَمْدُ لِلَّه) **پاشان سێ جار دەیوت :** (اللَّهُ أَكْبَر) **پاشان دەیوت :** ([سُبْحَانَكَ] اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي فَإِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ)[1] .



---

[1] صحيح سنن أبي داود رقم : (٢٦٠٤) .

# ڕەوشت و ئاكار و ڕەفتاری پێغەمبەر (ﷺ) لە : مامەڵەكردن لەگەڵ خەڵكدا

# (أَخْلَاقُهُ وَهَدِيهُ ﷺ فِي التَّعَامُلِ مَعَ النَّاس)

پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ڕوومـەت و ڕوخـساری لـە هـەموو خەڵك جوانتر بوو ، وە لە هەموو خەڵكیش ئەخلاق و ڕەوشت جوانتر بوو[(١)] ، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) دەمشڕ و بـەدكار نـەبوو ئەمە نە خوو بوو تێیـدا و نـە زۆریـشی لـە خـۆی دەكـرد كـە وابێـت ، وە لــە بازاڕەكانیـشدا هــات و هــاواری نــەدەكرد و پاداشتی خراپـەی بـە خراپـە نەدەدایـەوە بـەڵكو لێـدەبورا و چاوپۆشی دەكـرد[(٢)] ، وە هــەرگیز تۆڵـەی بـۆ خــوودی خـۆی نەدەكردەوە ئەگەر زوڵم و ستەمی لێبكرایـەت مەگـەر شـتێك لە حەرامكراوەكانی خوا ئەتك بكرایەت و ئەنجامبدرایەت ، وە ئەگـەر شــتێك لــە حــەرامكراوەكانی خـوا ئــەتك بكرایــەت و ئەنجامبدرایەت ئەوا لـە هـەمووان توونـدتر تـووڕە دەبـوو بـۆ ئـەوە[(٣)] ، وە سەرپـشك نـەكراوە لـە نێـوان دوو شـتدا ئـیللا

---

(١) صحيح البخاري رقم : (٥٨٥٠) .
(٢) صحيح سنن الترمذي رقم : (٢٠١٦) .
(٣) صحيح مسلم رقم : (٦٠٠٤) .

ئاسانترینەکەیانی هەڵبژاردووە ئەگەر تاوان نەبووبێت[١] ، وە هەرگیز بە دەستی نەیداوە لە هیچ شتێك و نەشیداوە لە هیچ کۆیلە و ئافرەت و خزمەتکارێك ئیللا مەگەر لە کاتی جیهاد و تێکۆشـان لـە پێنـاوی خـوادا بووبێـت[٢] ، وە (أَنَـــس ﵁) فەرموویـەتی : ((خَدَمْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) عَشْرَ سِنِينَ فَمَا قَالَ لِي : أُفٍّ قَطُّ ، وَمَا قَالَ لِي لِشَيْءٍ صَنَعْتُهُ : لِمَ صَنَعْتَهُ ؟ وَلَا لِشَيْءٍ تَرَكْتُهُ لِـــمَ تَرَكْتَهُ ؟))[٣] واتە : دە ساڵ خزمـەتی پێغەمبـەری خـوام (ﷺ) کـردووە هـەرگیز پێمـی نـەوتووە : ئۆف ، وە سـەبارەت بـە شـتێکیش کـردبێتم پێمـی نـەوتووە : بـۆ ئەمـەت کـردووە ؟ هـەروەها بـۆ شـتێکیش وازم لێهێنابێـت و نـەمکردبێت پێمـی نەوتووە : بۆ ئەمەت وازلێهێناوە و نەتکردووە .

وە پێغەمبەری خـوا (ﷺ) ئەگـەر تەوقـەی بکردایـەت یـان ئەگەر پیاوێك تەوقەی لەگەڵدا بکردایەت ئەوا دەستی لـە نـاو دەسـتی دەرنـەدەهێنا تـاوەکو ئـەو پیـاوە خـۆی دەسـتی دەردەهێنا[٤] ، وە بە روومەت و روخسار و قسەکردنی رووی دەکـردە ئـەو کەسـەی کـە قـسەی لەگەڵـدا دەکـرد تـا ئـەو

---

[١] صحيح البخاري رقم : (٣٣٦٧) .
[٢] صحيح مسلم رقم : (٦٠٠٤) .
[٣] صحيح سنن الترمذي رقم : (٢٠١٥) .
[٤] صحيح سنن ابن ماجه رقم : (٦٠٠٤) .

ئاستەی کە وا گومانی دەبرد ئەو خۆشەویسترینی خەڵکە بەلایەوە[1] ، وە (جَرِيــر)ی کوڕی (عَبْــدِ اللَّـــه) (رضي الله عنه) فەرموویەتی : ((مَا رَآنِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مُنْذُ أَسْلَمْتُ إِلَّا تَبَسَّمَ فِي وَجْهِي))[2] واتە : لەوەتەی کە موسڵمان بووم هیچ کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) منی نەبینیوە ئیللا پێکەنیوە و لێو بە خەندە بووە لە ڕوومدا .

وە (عَبْدِ اللَّه)ی کوڕی (الْحَـارِث) (رضي الله عنه) فەرموویەتی : ((مَا رَأَيْتُ أَحَدًا أَكْثَرَ تَبَسُّمًا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ))[3] واتە : هیچ کەسێکم نەبینیووە لێو بە خەندە بووبێت زیاتر لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) .

وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە شێوەیەك قسەی دەکرد ئەگەر کەسێکی هەژمارکار بیویستایەت وتەکانی بژمێرێت ئەوا دەیانیژمارد[4] ، وە قسەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) روون و یەکلا بوو هەرکەسێك گوێی لێبووبێت لێی تێگەیشتووە[5] ، وە قسەی نەدەدا بەسەر یەکدا[6] ، وە وتەیەکی سێ جار

---

(1) صحيح البخاري رقم : (٥٦٨٠) .

(2) صحيح البخاري رقم : (٢٨٧١) .

(3) صحيح سنن الترمذي رقم : (٣٦٤١) .

(4) صحيح البخاري رقم : (٣٣٧٤) .

(5) صحيح سنن أبـي داود رقم : (٤٨٤١) .

(6) صحيح البخاري رقم : (٣٣٧٥) .

دووباره دەكردەوە بۆ ئەوەی ئەو وتەیەی لـێ‌تێبگەن[١] ، وە ئەگەر شتێكی سەبارەت بە پیاوێك پێ‌بگەیشتایەت نەیدەوت : باشە بۆ فلان وای وتووه ، بەڵكو دەیوت : ئەوه بۆ خەڵكانێك واو وا دەڵێن[٢] .

وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە هەموو حاڵەتێكدا زیكری خوای دەكرد[٣] ، وە صەحابەكانی لە یەك مەجلیسدا سەد جار داوای لێخۆشبوونیان لێوە هەژمار كردووە و دەیوت : (رَبِّ اغْفِرْ لِـــي وَتُبْ عَلَيَّ ، إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ)[٤] ، وە فەرموویەتی : ((وَاللَّهِ إِنِّـــي لَأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ فِي الْيَـــوْمِ أَكْثَرَ مِنْ سَبْعِينَ مَرَّةً))[٥] واتە : سوێند بە خوا من لە ڕۆژێكدا زیاتر لە حەفتا جار داوای لێخۆشبوون لە خوا دەكەم و تەوبەی بۆلا دەكەم .

وە زۆرترین دوعای پێغەمبەر (ﷺ) بریتی بوو لە : ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْأَخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾[٦] ،

---

(١) صحيح البخاري رقم : (٩٥) .
(٢) صحيح سنن أبـي داود رقم : (٤٧٩٠) .
(٣) صحيح مسلم رقم : (٨٢٤) .
(٤) صحيح سنن أبـي داود رقم : (١٥١٨) .
(٥) صحيح البخاري رقم : (٥٩٤٨) .
(٦) صحيح البخاري رقم : (٦٠٢٦) .

هەروەها : (يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِـي عَلَى دِينِـكَ)[١] ، وە مەجليسەكانی بەم وتەيەی كۆتـايی پێدەهێنـا : (سُـبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِـحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُـوبُ إِلَيْكَ)[٢] .

وە پێغەمبەر (عَلَيهِ الصَّلَاةِ وَالسَّلَام) كەسێكی بە شەرم و حـەيا بـوو ، وە زۆر بـە شـەرم و حـەياتر بـوو لـە كچە عـازەب لـە ژووری پەردەپۆشراوی خۆيدا ، وە ئەگەر شتێكی پێناخۆش ببوايەت ئەوا لە روومەت و روخساريدا دەزانرا[٣] .

وە پێغەمبەر (عَلَيهِ الصَّلَاةِ وَالسَّلَام) بەخشندەترينی خەڵك بووە و هەرگيز داوای هيچ شتێكی لێنەكراوە و وتبێتـی : نـیيە[٤] ، وە مـاڵی دەبەخـشی بەخـشينی كەسـێك كـە لـە فـەقيری و نەداری نەترسێت[٥] ، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموويەتی : ((لَوْ أَنَّ لِـي مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا سَرَّنِـي أَنْ يَأْتِـيَ عَلَيَّ ثَلَـاثُ لَيَالٍ وَعِنْدِي مِنْهُ شَيْءٌ إِلَّا شَيْءٌ أَرْصُدُهُ لِدَيْنٍ))[٦] واتـە : ئەگـەر بە وێنەی كێوی ئوحد زێڕم هەبێت ئەوا پێم خۆش نیيە سێ

---

[١] صحيح سنن الترمذي رقم : (٢١٤٠) .
[٢] صحيح سنن أبـي داود رقم : (٤٨٦١) .
[٣] صحيح البخاري رقم : (٥٧٥١) .
[٤] صحيح البخاري رقم : (٥٦٨٧) .
[٥] صحيح مسلم رقم : (٥٩٧٢) .
[٦] صحيح البخاري رقم : (٦٠٨٠) .

شەوم بەسەردا بێت شتێكیم لەلا مابێتەوە مەگەر شتێك نەبێت كە هەڵیبگرم و ئامادەی بكەم بۆ بژاردنی قەرزێك .

وە پێغەمبەر (عَلَيهِ الصَّلَاةِ وَالسَّلَام) پشوودرێژترینی خەڵك بووە ، كەسی وا هاتووە بۆلای كە زۆر بە توندی جلەكانی ڕاكێشاوە بە شێوەیەك كە شوێنەواری لەسەر ملی دەركەوتووە و كاری تێكردووە و خراپیش لەگەڵی دواوە و پێغەمبەری خوایش (ﷺ) لای بەلادا كردووەتەوە و بزەیەكی كردووە و فەرمانی كردووە بەوەی كە ماڵی پێبدرێت[١] .

وە پێغەمبەر (ﷺ) ئازاترینی خەڵك بووە ، تەنانەت (بَـرَاء)ی كوڕی (عَـازِب) (رضي الله عنه) كە ناسراوبووە كۆیە لە ئازایەتیدا دەفەرموێت : "سوێند بە خوا ئێمە كاتێك كە جەنگ و شەڕ گەرم و سوور دەبوو خۆمان دەدایە پاڵ پێغەمبەری خواوە (ﷺ) و ئەومان پێش دەخست و ئێمە لە پشتیەوە دەبووین ، وە كەسی ئازا لە ئێمە ئەو كەسە بوو كە لە كاتی جەنگدا لە پێغەمبەر (ﷺ) نزیك دەبوویەوە لەبەر زۆر نزیك بوونەوەی لە دووژمن[٢] .

---

[١] صحيح البخاري رقم : (٢٩٨٠) .

(٢) صحيح مسلم رقم : (٤٥٩١) .

وه پێغەمبەر (عَلَيهِ الصَّلَاةِ وَالسَّلَام) فریادڕەس و هانابۆلابراوی صەحابەکانی بووه له کاتی پێویستیەکانیان ، قەرزی بۆ هەندێکیان بژاردووه وەکو (بِلَال رضي الله عنه)[1] ، وه ژنی هێناوه بۆ عازەبەکانیان[2] ، وه ڕۆیشتووه تکا و ڕجا بکات بۆ (جَــابِر رضي الله عنه) لای جوولەکەیەك و سێ جار ڕۆیشتووەتەوه بۆلای بۆ ئەوەی که قەرزەکەی بۆ دوابخات[3] ، وه ئافرەت دەهات بۆلای سکاڵا و گلەیی مێردەکەیی لەلا دەکرد ئەویش گوێی بۆ دەگرت[4] ، وه پیاو هاتووه بۆلای سکاڵا و گلەیی وشترەکەیی لەلا کردووه که نالەبار و ناڕەحەت بووه لەسەری ئەویش هەستاوه لەگەڵی و ڕۆیشتووه بۆلای وشترەکەی و وشترەکەش سکاڵای لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردووه که خاوەنەکەی زۆر ئیش و کاری پێدەکات و کەم ئالفی پێدەدات[5] ، تەنانەت ئاژەڵیش سکاڵای کردووه لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ئەوەی که مافی بۆ وەربگرێتەوه و خوایش ڕاستی فەرمووه : ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ

---

[1] صحيح البخاري وصحيح سنن أبـــي داود . (٢) صحيح البخاري رقم : (٢١٨٦) .

[3] صحيح البخاري رقم : (٥١٢٨) . (٤) صحيح البخاري .

[5] مسند الإمام أحمد رقم : (١٧٥٦٥) وصحيح الترغيب والترهيب رقم : (٢٢٧٠) .

﴿١٠٧﴾ ﴾ [الأنبياء] واتە : ئەی پێغەمبەر ئێمە تۆمان نەناردووە ئیللا ڕەحمەتێك نەبێت بۆ هەموو جیهانیان .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) كەسێكی خۆبەكەمزان بووە و خۆیی نەگرتووەتەوە لەوەی كە لەگەڵ بێوەژن و هەژار و كەمدەرامەتدا ڕێ بكات بۆ ئەوەی كە پێویستی بۆ دەربكات[1] ، وە ئافرەتێك هاتووە بۆلای و وتوویەتی : من پێویستیەكم پێت هەیە ئەویش فەرموویەتی : ((يَا أُمَّ فُلَانٍ انْظُرِي أَيَّ السِّكَكِ شِئْتِ حَتَّى أَقْضِيَ لَكِ حَاجَتَكِ)) واتە : ئەی دایكی فلان سەیربكە بزان كام ڕێگاوبانت دەوێت لەگەڵتدا دەبم تاوەكو پێویستیەكەت بۆ بەجێدێنم ، پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵیدا دانیشت تاوەكو پێویستیەكەیی بۆ بەجێهێنا[2] .

وە پێغەمبەر (ﷺ) بانگدەكرا بۆ نانی جۆ و ڕۆنێك كە لەبەر زۆری مانەوەی بۆنی گۆڕابوو ئەویش وەڵامی دەدایەوە و دەڕۆیشت[3] ، وە فەرموویەتی : ((لَوْ أُهْدِيَ إِلَيَّ كُرَاعٌ لَقَبِلْتُ ، وَلَوْ دُعِيتُ عَلَيْهِ لَأَجَبْتُ))[4] واتە : ئەگەر پێچكەی ئاژەڵێكم

---

(١) صحيح سنن النسائي رقم : (١٤١٤) .
(٢) صحيح مسلم رقم : (٥٩٩٨) .
(٣) رواه الترمذي في الشمائل رقم : (٣٢٦) .
(٤) صحيح البخاري رقم : (٤٨٨٣) .

به دیاری پێبدرێت قەبوڵی دەکـەم ، وە ئەگـەر دەعـوەتیش بکرێم بۆی وەڵام دەدەمەوە .

وە پێغەمبەر (ﷺ) قەڵغانێکی لای جوولەکەیەك بوو هەندە پارەی نەبوو کە لە بارمتەیی دەربازی بکات تاوەکو مرد[١] .

وە پێغەمبـەر (عَلَيهِ الصَّلَاةِ وَالـــسَّلَام) منـداڵانی دەلاوانـدەوە و یاری لەگەڵدا دەکـردن ، (أَنَس ﷺ) فەرموویـەتی : ((مَا رَأَيْتُ أَحَدًا كَانَ أَرْحَمَ بِالْعِيَالِ مِنْ رَسُولِ اللَّـــهِ ﷺ))[٢] واتـە : هـیچ کەسـێکم نـەبینیووە بـە ڕەحمـتر بـە خێـزان و منـداڵ لـە پێغەمبەری خـوا (ﷺ) ، وە بـەلای منداڵانـدا تێپـەڕ دەبـوو و سەلامیشی لـێدەکردن .



(١) صحيح البخاري رقم : (٢٧٥٩) .

(٢) صحيح مسلم رقم : (٥٩٨٠) .

## ئاكار و ڕەفتاری پێغەمبەر (ﷺ) لە :
## ماڵەکەی و لە خەوتنیدا
## (هَدِيهُ ﷺ فِي بَيْتِهِ وَفِي نَوْمِهِ)

بینای ماڵەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بریتی بوو لە خشت و بانەکانیشی بریتی بوون لە گەڵای دارخورما[1] ، وە ماڵەکانی تەنگ بوون بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك کە بیویستایەت لە شەونوێژدا سوجدەبەرێت ئەوا سەرپەنجەکانی دەکرد بە لەشی (عائشة)دا (رضي الله عنها) و ئەویش هەردوو قاچی هەڵدەکرد و کاتێکیش هەڵبسایەتەوە ڕایانیدەخستەوە[2] ، وە ئەو کەسەی کە دەڕۆیشتە ژوورەوە ئەگەر دەستی ببردایە بۆ سەقفی خانووەکەی ئەوا دەستی بەری دەکەوت ، وە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك کە دەڕۆیشتە ماڵەوە سەرەتا سیواکی دەکرد[3] ، وە سەلامی دەکرد لەو کەسانەی کە تێیدا دەبوون ، وە بە شێوازێك سەلامی دەکرد کەسی خەوتووی بە ئاگانەدەهێنایەوە و کەسی بەئاگاش گوێی لێدەبوو[4] ،

---

(١) صحيح البخاري رقم : (٤٣٥) .
(٢) صحيح البخاري رقم : (٣٧٥) .
(٣) صحيح مسلم رقم : (٥٩٠) .
(٤) صحيح مسلم رقم : (٥٣٣٠) .

**وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((إِذَا وَلَجَ الرَّجُلُ بَيْتَهُ فَلْيَقُلْ : اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَ الْمَوْلَجِ وَخَيْرَ الْمَخْرَجِ ، بِسْمِ اللهِ وَلَجْنَا ، وَبِسْمِ اللهِ خَرَجْنَا ، وَعَلَى اللهِ رَبِّنَا تَوَكَّلْنَا ، ثُمَّ لِيُسَلِّمْ عَلَى أَهْلِهِ))[1] .**

---

[1] رواه أبو داود رقم : (٤٤٣٢) (١٣ / ٢٩٢) ، السلسلة الصحيحة رقم : (٢٢٥) (١ / ٢٢٤) .

**تێبینییەك** : **ئەم فەرموودەیە** (ضعيف)**ـە ، زانای فەرموودەناس شێخ ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لێبێت گەڕاوەتەوە لە تەصحیح كردنی و بە** (صحيح) **ژماردنی ، ئەوەیش لە پاش توێژینەوەیەكی ورد سەبارەت بە سەنەدی ئەم فەرموودەیە ، هەروەها فەرموودەناسی شاری مەدینەیش شێخ** (عبد المحسن العباد) **خوا بیپارێزێت ئاماژەی بۆ ئەم تەراجوعەی شێخ ئەلبانی كردووە و خۆیشی بە فەرموودەیەكی** (ضعيف)**ی داناوە ،**
**بڕوانە** : سلسلة الأحاديث الضعيفة للألباني رقم : (٥٨٣٢) (١٢ / ٧٣٠ ــ ٧٣٢) ، وشرح سنن أبي داود للشيخ عبدالمحسن العباد .

* **وە دەكرێت لە بری ئەو زیكرە [كە فەرموودەكەی لاوازە] لە كاتی ڕۆیشتنە ژوورەوە بۆ ماڵ تەنها بڵێت (بِسْمِ اللهِ) بە بەڵگەی فەرموودەكەی پێغەمبەر (ﷺ)** : ((إِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ بَيْتَهُ **فَذَكَرَ اللهَ عِنْدَ دُخُولِهِ** ...)) ، **پاشان سڵاوبكات لە خێزان و كەسوكاری و بڵێت : (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ) ئەویش بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە :**

عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ (رضي الله عنه) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ : ((ثَلَاثَةٌ كُلُّهُمْ ضَامِنٌ عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ : ... ، **وَرَجُلٌ دَخَلَ بَيْتَهُ بِسَلَامٍ** فَهُوَ ضَامِنٌ عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ)) رواه أبو داود رقم : (٢٤٩٦) وصححه الألباني ، وأورده النووي في "الأذكار" تحت (**باب ما يقول إذا دخل بيته**) ثُمَّ قال : (ومعنَى "ضَامِنٌ عَلَى اللَّهِ تَعَالَى" : أي صاحبُ ضمانٍ ، والضمان : الرعايةُ للشيءِ ... فمعناه : **أَنَّهُ في رعاية الله تعالى** ، وما أجزل هذه العطية ، اللهُّم ارزقناها) ، وراجع المصادر لشرح هذا الحديث .

**واتە : سێ كەس هەن هەموویان لە ئەستۆی خوای گەورەدان : ... ، وە پیاوێكیش بە سەلامكردنەوە دەڕواتە ناو ماڵەكەیەوە ئەویش لە ئەستۆی خوای گەورەدایە و دەیپارێزێت .**

واتە : ئەگەر پیاو ڕۆیشتە ژوورەوە بۆ ناوماڵەکەی ئەوا با بڵێـت : (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَ الْمَوْلَجِ وَخَيْرَ الْمَخْرَجِ ، بِـــسْمِ اللهِ وَلَجْنَا ، وَبِسْمِ اللهِ خَرَجْنَا ، وَعَلَى اللهِ رَبِّنَا تَوَكَّلْنَا) ، ئەنجا با سـڵاو بکات لە خێزان و کەسوکاری .

وە هەواڵیـشیداوە ئەگـەر کەسـێك لــە کـاتی ڕۆیـشتنە ژوورەوەی بـۆ مـاڵ و لـە کـاتی نانخواردنیـدا زیکـری خـوای نەکرد ئەوا شەیتان هاوبەشی ئەو خێزانە دەکات لـە شـوێنی مانەوە و لە خواردنەکەشیان[١] .

وە پێغەمبـەر (عَلَيهِ الصَّلَاةِ وَالــسَّلَام) کاتێـك کـە لـە ماڵەکـەی دەڕۆیشتە دەرەوە دەیـوت : (بِسْمِ اللهِ ، تَوَكَّلْــتُ عَلَــى اللهِ ، اللَّهُمَّ إِنِّــي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَضِلَّ أَوْ أُضَلَّ ، أَوْ أَزِلَّ أَوْ أُزَلَّ ، أَوْ أَظْلِمَ أَوْ أُظْلَمَ ، أَوْ أَجْهَلَ أَوْ يُجْهَلَ عَلَيَّ / بە ناوی خـواوە ، پـشتم بـە خوا بەست ، خوایـە مـن پـەنات پـێدەگرم لـەوەی کـە خـۆم گـومڕا بــبم یــان کەسـێکی تـر گـومڕام بکـات ، یــان پــێم بخلیسکێت و بکەومە نـاو هەڵـەوە یـان کەسێکی تـر توشـی پێخلیسکانم بکات و بمخاتە ناو هەڵـەوە ، یـان زوڵـم و سـتەم

[١] صحيح مسلم رقم : (٣٧٦٢) .

له كەسێك بكەم یان كەسێك زوڵم و ستەمم لـێ بكـات ، یـان خۆم كارێكی نەفامانە و نەزانكارانـە بكـەم یـان كەسێكی تـر كارێكی نەفامانە و نەزانكارانەم لەبەرامبەردا بكات)[1] .

وە پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵیشیداوە هەركەسێك بڵێـت : (بِسْمِ اللهِ ، تَوَكَّلْـــتُ عَلَى اللهِ ، لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللهِ) ئـەوا پـێی دەوترێت : (تـۆ هیدایەتـدرایت و خـەمی كاروبارەكانـت نـەبێت بـۆت ئاسـان دەكرێـت و پارێزراویـشیت لـە شـەڕ و خراپـە) و شەیتانیش خۆیی لـێلادەدات و لـێی دوور دەكەوێـتەوە[2] .

وە بە (عائشة رَضِيَ اللهُ عَنْهَـــا) وتراوە : ئایا پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لە ناو ماڵی خۆیدا چی دەكرد ؟ ئەویش فـەرمووی : ((كَـــانَ يَكُونُ فِي مِهْنَةِ أَهْلِهِ ، فَإِذَا سَمِعَ الْأَذَانَ خَـــرَجَ))[3] واتـە : لـە سـەروكاری خێزانەكـەی دەبـوو ، وە كـە بـانگی دەبیـست دەڕۆیشتە دەرەوە بۆ مزگەوت .

هەروەها (عائشة رَضِيَ اللهُ عَنْهَـــا) فەرموویەتی : ((كَانَ بَشَرًا مِنْ الْبَشَرِ : يَفْلِي ثَوْبَهُ ، وَيَحْلُبُ شَاتَهُ ، وَيَخْدُمُ نَفْسَهُ))[4] واتـە : پێغەمبـەر (ﷺ) مـرۆڤـێك بووە لە مرۆڤـەكان : پۆشاكـەیی دەوژنـی و

---

(1) صحيح سنن الترمذي رقم : (٣٤٢٧) .
(2) صحيح سنن أبـــي داود رقم : (٥٠٩٧) .
(3) صحيح البخاري رقم : (٥٠٤٨) .
(4) سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٦٧١) .

مێكەیی دەدۆشی و خزمەتی خۆیی دەكرد .

وە باشترینی خەڵك بووە بۆ خێزانی[1] و لە هەموو خەڵك هەڵسوكەوت و مامەڵەی باشترە بووە : هەر بۆیە گوێی دەگرت لە قسەوباسی دوورودرێژی (عائشة) لە كاتی باسوخواسی پاش عیشایان و قسەوباسەكەشی پێنەدەپچڕاند و لە پاش ئەوەیش دەیلاواندەوە[2] ، وە پێشبڕكێی كردووە لەگەڵ (عائشة)دا و (عائشة) پێشیكەوتووە و ئەویش پێش (عائشة) كەوتووە[3] ، وە كاتێك كە (عائشة) حەزی كرد سەیری مێردمنداڵە حەبەشیەكان بكات كاتێك كە لە ڕۆژی جەژندا یاریان دەكرد دەرفەتی پێدا لە پاشیەوە سەیر بكات تاوەكو (عائشة) بێزاربوو[4] ، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوێكی ئاسان بووە ئەگەر (عائشة رضي الله عنها) حەزی لە شتێك بكردایەت ئەوا پێغەمبەریش (ﷺ) دوای حەزەكەی ئەو دەكەوت[5] ، وە پێغەمبەر (ﷺ) لای وشترەكەی دانیشتووە و ئەژنۆی داناوە

---

(١) صحيح سنن الترمذي رقم : (٣٨٩٥) .

(٢) صحيح البخاري رقم : (٤٨٩٣) .

(٣) صحيح سنن أبي داود رقم : (٢٥٨٠) .

(٤) صحيح البخاري رقم : (٤٩٣٨) .

(٥) صحيح مسلم رقم : (٢٩٣١) .

بۆ ئەوەی كە (صَفِيَّة)ی خێزانی (رَضِيَ اللهُ عَنهَـــــا) پـێی بخاتـە سـەر ئـــەژنۆی پــــیرۆزی و ســــواری وشـــــترەكە ببێـــت[1] ، وە خۆڕاگربووە لە ئاست غەیرەی خێزانەكانی و صەبر و ئـارامی لەسەر گرتوون و دەیلاواندنەوە[2] .

وە دۆشەك و جێی خەوتنەكەی پێغەمبەر (ﷺ) لە پێست و چەرم بووە كە توێكڵەی دارخورمای تێكرابوو بەهەمان شێوە سەرینەكەشـــی[3] ، وە جارێكیـــان پێغەمبـــەر (ﷺ) لەســـەر حەسـیرێك خـەوت تـاوەكو شـوێنەواری لەسـەر لاكەلەكـەی پـیرۆزی (ﷺ) دەركـەوت[4] ، وە كاتێـك كـە دەڕۆیـشتەسەر جێی خەوتنەكەی هەموو شەوێك هەردوو لەپی كۆدەكردەوە و فووی دەكرد پێیانـدا و ئـەم سـورەتانەی تێـدا دەخوێنـدن : ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ﴾ و ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ﴾ و ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ پاشـان هـەردوو دەسـتی دەهێنـا بـەوەی كـە لـە توانایدا هەبوو لە لەشی ، سەرەتا بە هەردووكیان لە سەری و روخساری و پێشەوەی لەشی دەستی پـێدەكرد ، سـێ جـار

---

(١) صحيح البخاري رقم : (٢١٢٠) .
(٢) صحيح البخاري رقم : (٤٩٢٧) .
(٣) صحيح البخاري رقم : (٦٠٩١) و (٥٥٠٥) .
(٤) صحيح البخاري رقم : (٥٥٠٥) .

**ئەوەی دەکرد**[٥] ، **هەروەها دەیوت :** (الْحَمْدُ للَّه الَّذي أَطْعَمَنَا وَسَقَانَا ، وَكَفَانَا وَآوَانَا ، فَكَمْ مِـــمَّنْ لَا كَافِيَ لَهُ وَلَا مُئْوِي[١] / **سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە خواردن و خواردنەوەی پێداین ، وە زیان و خراپەی لێدوورخستینەوە و جێگای حەوانەوەی پێبەخشین ، چونکە چەندین خەڵك هەیە هیچ کەسێك نییە زیان و خراپەیان لێدووربخاتەوە و پەنایان بدات و جێگای حەوانەوەیان پێبدات) ، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك کە دەڕۆیشتە سەر جێگای خەوتنەکەی لەپی ڕاستی دەخستە ژێر گۆنای ڕاستی و دەیوت :** (اللَّهُمَّ قِنِـــــي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ عِبَادَكَ[٢] / **خوایە بمپارێزە لە سزای خۆت لەو ڕۆژەی کە عەبدەکانت زیندوو دەکەیتەوە) ، هەروەها دەیوت :** (بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ أَمُوتُ وَأَحْيَا[٣] / **خوایە بە ناوی تۆوە دەمرم و زیندوو دەبمەوە) ، وە بەسەر لای ڕاستیدا دەخەوت و دەیوت :** (اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ ، وَوَجَّهْتُ وَجْهِي إِلَيْـــكَ ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ ، وَأَلْـــجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ ، رَغْبَـــةً وَرَهْبَـــةً

---

[٥] صحيح البخاري رقم : (٤٧٢٩) .

[١] صحيح مسلم رقم : (٦٨٣٢) .

[٢] صحيح سنن أبـــي داود رقم : (٥٠٤٧) .

[٣] صحيح البخاري رقم : (٥٩٦٥) .

إِلَيْكَ ، لَا مَلْجَأَ وَلَا مَنْجا مِنْكَ إِلَّا إِلَيْكَ ، آمَنْتُ بِكِتَابِـــكَ الَّـــذِي أَنْزَلْتَ ، وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ / **خوایـه مـن گیـانی خـۆمم دایـه دەسـتی تـۆ ، وە روومــەتی خـۆمم ڕوو كـرد لــه تــۆ ، وە كاروباری خۆمم بە تۆ ڕاسپارد ، وە پشتم بە تـۆ بەسـتووە ، بە مەبەستی وەدەست خستنی ئـەوەی كـه لـه لای تۆیـه لـه خێر و پاداشت و پەناگرتنیش له ئەوەی كه لـه لای تۆیـه لـه سزا و عیقاب ، هیچ پەناگه و ڕزگاركەرێك نیـیه له سـزای تـۆ تەنها خۆت نەبیت ، خوایه من بـاوەڕم هێنـاوە بـەو كتێبـەت كه داتبەزاندووە ، وە بـەو پێغەمبەرەشـت كـه ناردووتـه) وە پێغەمبەری خـوا** (ﷺ) **فەرموویـەتی :** ((مَنْ قَالَهُنَّ ثُمَّ مَاتَ فِي لَيْلَتِهِ مَاتَ عَلَى الْفِطْرَةِ))[١] **واتـه : هەركەسـێك ئەمـه بڵێـت و پاشان لـەو شـەوەیدا مـرد ئـەوا لەسـەر دینـداری و سـوننەت مردووە .**

**هەروەها پێغەمبـەر** (ﷺ) **دەیـوت :** (اللَّهُمَّ خَلَقْتَ نَفْـــسِي وَأَنْتَ تَوَفَّاهَا ، لَكَ مَمَاتُهَا وَمَحْيَاهَا ، إِنْ أَحْيَيْتَهَا فَاحْفَظْهَا ، وَإِنْ أَمَتَّهَا فَاغْفِرْ لَهَا ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَافِيَةَ[٢] / **خوایه تـۆ گیـانی**

---

[١] صحيح البخاري رقم : (٥٩٥٦) . (٢) صحيح مسلم رقم : (٦٨٢٦) .

**منت دروست كردووه و تۆيش دەيمرێنى ، مردن و ژيانى لاى تۆيــه ، ئەگــەر دەيــژێنيت ئــەوا بيپــارێزە ، وە ئەگــەريش دەيمرێنيت ئەوا لـێى خۆشبە ، خوايـە مـن داواى بێوەييـت لـــێ دەكـــەم) ، وە پێغەمبـــەر (ﷺ) نەدەخـــەوت تـــاوەكو سـورەتى (﴿الٓمٓ ، تَنزِيلُ﴾ السَّجْدَة) و سـورەتى (﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ﴾)ى دەخوێنـــدەوە[1] ، وە هانيـــشيداوە بـــۆ خوێندنـەوەى** (آيَــةُ اَلْكُرْسِــي)[2] **و دوو ئايـەتى كۆتـايى لـە سورەتى** (البقرة) **و هەواڵيشيداوە هەركەسێك ئەم دوو ئايەتـە لە شەوێكدا بخوێنێت ئەوا دەيپارێزن[3] ، وە هانيـشيداوە بۆ وتنى :** (بِاسْمِكَ رَبِّ وَضَعْتُ جَنْبِــي وَبِكَ أَرْفَعُهُ ، إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَارْحَمْهَا ، وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَــادَكَ الصَّالِحِينَ)[5] **/ ئەى پەروەردگارم بـە نـاوى تـۆوە لاكەلەكـەمم دانا و بە نـاوى تۆيـشەوە بـەرزى دەكەمـەوە ، ئەگـەر ڕۆح و گيانم دەگريتـەوە و دەيبەيتـەوە ئـەوا رەحمـى پـێبكـە ، وە**

---

(1) صحيح سنن الترمذي رقم : (٢٨٩٢) .

(٢) صحيح البخاري رقم : (٤٧٢٣) .

(3) صحيح البخاري رقم : (٤٧٢٢) .

(٤) صحيح البخاري رقم : (٥٩٦١) .

(5) صحيح البخاري رقم : (٥٩٦١) .

**ئەگــەریش بەریدەدەیتــەوە و دەیگێڕیتــەوە ئــەوا بیپــارێزە بەوەی كە عەبدە صاڵحەكانتی پێدەپارێزیت) .**

**هەروەها هانیشیداوە بـۆ وتنـی : (**اللَّهُــمَّ عَــالِمَ الْغَيْــبِ وَالشَّهَادَةِ ، فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ ، رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَــهُ ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي وَمِــنْ شَــرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ[١] **/ خوایە تۆ زانای پەنهانی و بینراوەكانیت ، بەدیهێنــەری ئاسمانــەكان و زەویــت ، پــەروەردگار و هەڵسوڕێنەری هەموو شتێكیت ، شایەتی دەدەم بـەوەی كـە هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت جگە لـە تـۆ ، پەنات پێدەگرم لە شەڕ و خراپەی نەفس و دەروونی خۆم و لە شەڕ و خراپەی شەیتان و ئەوەی كە بانگەشەی بۆ دەكات لە شیرك ئەنجامدان بۆ خوا) .**



[١] صحيح سنن الترمذي رقم : (٣٣٩٢) .

# كۆتایی

خوایە ستایشی پێغەمبەرەکەمان (مُحَمَّد) و کەسوکاری و خێزانــەکانی و نــەوە و وەچــەکانی بکــە هــەروەکو چــۆن ستایـشی کەسـوکاری (إِبْــــرَاهِيم)ــت کـردووە بەڕاسـتی تـۆ ستایشکراو و گـەورەیت ، وە فـەڕ و بەرەکـەتی خـۆت بڕێـژە بەسەر پێغەمبەرەکەمان (مُحَمَّد) و کەسوکاری و خێزانەکانی و نـەوە و وەچـەکانی هـەروەکو چـۆن فـەڕ و بەرەکـەتی خۆتـت ڕژاندووە بەسەر کەسوکاری (إِبْرَاهِيم) بەڕاستی تۆ ستایشکراو و گەورەیت ، خوایە هەروەکو چۆن مەحروم و بێبەش بووین لـە سەیرکردنی خۆشەویستمان پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) و دانیـشتن لەلای و هاوەڵێتی کردنی لە دونیادا ئەوا مەحروم و بێبـەشمان مەکــە لەمانــە لــە دواڕۆژدا ، وە دراوســێیەتی پێغەمبــەری خۆشەویست (ﷺ) لە بەهەشتدا بکـە بـە نـسیبمان ، وە تـام و چێژی سـەیرکردن و قـسەکردن لەگـەڵی ببەخـشە پێمـان ، وە بمانبەرە سەر حەوزەکەی و بە دەستی پیرۆزی ئاومان بـدەرێ ئاوخواردنەوەیەك کە هەرگیز لە پاش ئـەوە تینـوو نـەبین ، وە تکا و شەفاعەتی بکە بە نسیبمان ئەی خوای بەخشندە .

خوایە موەفقمان بکە بۆ هاوەڵێتی کردنی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) و چاولێکردنی لە هەموو بچوك و گەورەیەکدا ، وە پێغەمبەر (ﷺ) و سوننەتەکەی خۆشەویستر بکە بەلامانەوە لە باوکمان و دایکمان و منداڵەکانمان و تێکڕای خەڵك .

خوایە لە بری ئێمە پاداشتی بدەرەوە بە باشترین و زۆرترین پاداشت ، وە پاداشتی بدەرەوە بە باشترین پاداشتێك کە پاداشتی پێغەمبەرێکت پێدابێتەوە لە بری ئوممەتەکەی ، وە پلەی (وَسِيلَة) و (فَضِيلَة)ی بە نسیب بکە و بیگەیەنە بە پلەوپێگەی ستایشکراو (الْمَقَامُ الْمَحْمُود) کە خۆت بەڵێنت پێیداوە بەڕاستی تۆ بەڵێن دواناخەیت .

وكتبه / أبو خالد أيمن بن عبد العزيز أباني
٦ / ٦ / ١٤٢٥من هجرة المصطفى ﷺ
بالمسجد النبوي بالمدينة المنورة
Abukhaleda@gawab.com
ص.ب : ٤١٤٣٥ – الرياض : ١١٥٢٣



**سوپاس بۆ خوای گەورە دەستمدایە وەرگێڕانی**

**ئەم کتێبە زۆر بەسوود و گرنگە**

**لە ناو مزگەوتی (شێخ إبراهیم) / لە شاری کەلار**

**لە ڕۆژی یەك شەممە / پاش نوێژی عەسر**

**(٦ / ربیع الآخر / ١٤٣٩) بەرامبەر بە (٢٤ / ١٢ / ٢٠١٧)**

**هەروەها سوپاس بۆ خوای گەورە تەواو بووم لە وەرگێڕانی**

**لە ڕۆژی یەك شەممە / کاتژمێر : (٠٦ : ١٢)ی لە کاتی بانگی نیوەڕۆ**

**(١٩ / صەفەر / ١٤٤٠) بەرامبەر بە (٢٦ / ١٠ / ٢٠١٨)**

**لە ناو** (الروضة الشريفة) **لە ناو مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) لە شاری مەدینە**

**محمد عبد الرحمن لطيف**

وَالْحَمْدُ للَّه رَبِّ الْعَالَــمين

وَصَلَّــى اللهُ وَسَلَّم عَلَــى نَبِيِّنَا مُــحَمَّدٍ وَعَلَى آلهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِين



## گرنگترینی سەرچەوەكان

(١) صحيح البخاري . (٢) صحيح مسلم .
(٣) صحيح أبـي داود للألبانـي . (٤) صحيح الترمذي للألبانـي .
(٥) صحيح النسائي للألبانـي . (٦) صحيح ابن ماجه للألبانـي .
(٧) مـختصر الشمائل الـمحمدية الترمذي / الألبانـي .
(٨) شمائل الرسول (ﷺ) لابن كثير .
(٩) زاد المعاد لابن القيم .
(١٠) الصحيح المسند من الشمائل الـمحمدية لأم عبد الله بنت مقبل الوادعي .
(١١) الصحيح المسند من أذكار اليوم والليلة لـمصطفى العدوي .
(١٢) صفة صلاة النبـي (ﷺ) للألبانـي .
(١٣) صفة صلاة النبـي (ﷺ) لابن باز .
(١٤) مـحبة الله ورسوله (ﷺ) لصالح الشامي .
(١٥) من الـهدي النبوي في الـمترل لنيرة خان .
(١٦) مـحبة النبـي (ﷺ) لعلي بادحدح .
(١٧) شريط آداب اللباس لـمحمد الـمنجد .
(١٨) حصن المسلم لسعيد علي القحطانـي .
(١٩) قرة عيون الـمصلين لسعيد علي القحطانـي .
(٢٠) نزهة الفضلاء تـهذيب سير أعلام النبلاء لـمحمد عقيل موسى .
(٢١) صحيح الـجامع للألبانـي .
(٢٢) سلسلة الأحاديث الصحيحة للألبانـي .
(٢٣) صحيح الترغيب والترهيب للألبانـي .
(٢٤) جلاء الأفهام لابن القيم .
(٢٥) شرح صحيح مسلم للنووي .

# ناوەڕۆك

خوێنەری بەڕێز :

ئەم کتێبە زۆر بەسوودەیش بخوێنەرەوە :

# حەقیقەتی شایەتیدان
## بەوەی کە
## (مُحَمَّد ﷺ) پێغەمبەری خوایە

(حقيقةُ شهادةِ : أَنَّ مُحمَّداً رسولُ اللهِ ﷺ)

**لە دانانی**

**زانای گەورە و پایەدار**

عبد العزيز بن عبد الله بن محمد آل الشيخ حفظه الله

**( موفتی تێکڕای شانیشینی عەرەبستانی سعودیٚ و سەرۆکی دەستەی گەورە زانایان )**

**وەرگێڕانی**

**محمد عبد الرحمن لطيف**

**وتارخوێنی مزگەوتی (شێخ إبراهيم) / کەلار**